**دەزگەها سپیریز یا چاپ و وەشانێ**

**خودانێ ئمتیازێ: حافظ قاضي**

**سەرنڤیسەر: مؤيد طيب**

* کتێبا هژمار (١٤)
* قەدری جان شاعیری داهێنەر و نیشتمانپەوەر
* نڤیسینا: ئازاد عبدالعزیز مزووری
* دەرهێنانا هونەری: ربیع خەلاتی
* بەرگ: نزار رشاد
* سەرپەرشتیارێ چاپێ: زاگرۆس محمود
* ژمارا سپاردنێ: (٤٦) سالا ٢٠٠٢
* چاپخانە: وەزارەتا پەروەردێ ـ هەولێر
* تیراژ: (٥٠٠) دانە

# ناوەڕۆک

بەرهەمەکانی

پاشکۆکان

پاشکۆی یەکەم

**• شیعرەکانی**

١- هاوار هەبە. گازی ل دوویە.

٢- بەردێلک.

٣- هەسنکەر.

٤- دشورەزارەکێ دە.

٥- تابووتا بخوین.

٦- جەگەرخوین.

٧- خەونا هشیاریێ.

٨- دادێ.

٩- دەست ژێ بوو.

١٠- جوهابا لاوانی ل دیبیا هاوارێ.

١١- هەی... دنیا فانی.

١٢- دێرک.

١٣- رەشبەلەک.

١٤- شین.

١٥- رەیا تازە.

١٦- بەگێ ئاخر زەمان.

١٧- کاروانێ مە.

١٨- سەرداریێ کوردان... بارزانی.

**پاشکۆی دووەم**



**پاشکۆی سێیەم**

**سوپاسنامە**

* سوپاسی هەردوو بەڕێزان دکتۆر عەزیز گەردی و مامۆستا بەکر شاکر دەکەم، کە زۆر یارمەتییان دام.
* سوپاس بۆ سەیدایێ هێژا دلاوەر زەنگی، کە چەند پارچە شیعری قەدری جانی پێشکەش کردم.
* سوپاس بۆ هاوکاری هەردوو بەڕێزان ئیحسان تاهیر و ڕێکارێ مزویری، هەروەها خانمی خۆشنووس شیوا سلێمان بێدارونی دەکەم، کە پەرتووکەکەمی بە دەستنووسێکی جوان نووسییەوە.

## پێشگۆتن

من دەستنڤیسا کاک ئازاد مزویری ب ناڤێ (قەدری جان-داهێنان و ولاتپارێزی) ڤەخویند. دلشادبووم، کو هەولەکا دن هاتەدان ژ سەخمەراتی رۆنڤەکرنا ئالیەکی هەری گرنگ ژ ئەفراندنێن پێشەنگەکێ شعرا نوی یا کوردی، کو بێی ناڤ و ئەزموونگەری یا قەدری جان هیچ بابەتەک و ڤەکۆلینەکا بنەجه و تەڤاف لسەر رێبازا ئەدەبیاتا نوی یا کوردی ناهێتەکرن ب تایبەتی د دیالێکتا کورمانجییا باکووردا.

قەدری جان، ئەو شاعرێ نیڤ خەمگین و نیڤ ئازریای، د هەلبەستێن خوە دا وەکهەڤییا مافان و ڤیانا وەلات لسەر پێوەرێ نەتەوەخوازییا کورد هەڤسەنگ دکر، هەرچەندە پاراستنا ڤێ هەڤسەنگیێ پرسەکا پڕ ئالۆزە، سەختە، گرانە و ب ملێ هەر کەسەکی ڤە نایێ، لێ ئەوی ب درێژاییا زێدەتر ژ چل سالان سەلماند، کو ب رێیا شعرێ، کورتە چیرۆکێ، گۆتاران، وەرگەڕاندنێ ژ زمانێن دن، دکارە بەرگریێ ژ مافێن گەلێ خوە بکەو ببە ستوونەکا موکم دنیڤا سەدسالیا بیستێدا.

دکێمن، ئەو کەسێن وەلات کرییە شعرو ددلێ خوە دا هەلگرتی، و د وێ جڤاتا بژارە ژی دا، قەدری جانی جهێ خوە گرتییە و د خەلەکا هزرێن وی دا دۆزەکا مەزن تێ دیتن.

د بەشێ یەکەمێ ڤێ پەرتووکێدا پێنج بابەت ل دور ژینەنیگارو ویستگەهێن هەرە بەرچاڤێن ئەزموونا وی هاتینە رێزبەندکرن،

زێدەتر لسەر ژیان و ب سەرهاتییا وی راوەستیایە و بیروراییێن چەندین نڤیسکاران وەکە گرۆڤ و بەلگە دانینە بەردەست. پتر ژ هەمیان لسەر کێشەیا رۆژا، ئانکو سالا، ژ دایکبوونا وی چوویە، هەتا داویێ دگەهتە وێ باوەرییا دلاوەر زەنگی پێ گەیشتی و د پەرتووکا خوەدا «نڤیسکاری کورد قەدری جان» دا تۆمارکری. لێ چما ئەڤ کێشەیە هندە مەزن بوویەو دەربارەی ژ دایکبوونا شاعرەکی نویخوازێ مینا قەدری جانی کو گەلەک هەڤال و دوست و زارۆیێ وی هێشتا د ژیانێ دانەو ئەو ب خوە مامۆستا بوویە و ناسنامەو کارت و پەروەندێن وی هێشتا ل دەزگەهێن کارو تۆمارکرنێدا ماینە. هەروەکە دلاوەر زەنگی وێنەیەکێ پێناسەیا وی یا چاخێ قوتابی ل ئەنستیتویا مامۆستایان ل قونیە دکتێبا خوە یا ناڤبریدا بەلاڤکرییە لێ کاک ئازادی ئێماژە پێ نەکرییە.

دپشکا دوویی دا، پەیوەندییێن شاعری دگەل سەرکردێن کوردان، هەروەسا دگەل رەوشەنبیرو نڤیسکارێن کورد ژی کو هەڤچاخێ وی بوونە، خویا دکە.

دپشکا سێیەمدا کو بەرهەمێن شاعری ڤەدگریت، ئەو ژی ژ سێ پاشکۆیان پێکهاتییە:

پاشکۆیا یەکەم (٣٠) شعرێن قەدری جانی کۆم کرینە و پاشکۆیا دوویێ شعرێن شاعران یێن بۆ وی نڤیسین. پاشکۆیا سێیەم تایبەتە ب ئەلبوما وێنەیان ڤە.

ژ بلی هنەک کەم و کورتییێن بچویک ئەڤ پەرتووکە ژ بزاڤەکا پڕ ماندیبوون درستبوویە، و پێنگاڤەکا دجهێ خوە دایە ژ بۆ خرڤەکرنا سەرجەم دیوانا قەدری جانی کو پشکەکا کێم ژێ مایەو

رێیا پێگەهاندنا وێ گەلەک دەستخوەشبوویە. هەلبەتە ئەڤە ژی دێ بیتە کەلێنەک ژ تەڤایا بەرهەمێن وی ییێن ئەدەبی و هزری کو ب هیمەتا خێرخوازێن قادا خزمەتا گەل و وەلاتی دێ ئەو ژی بهەڤرا رۆناهییێ بیێن.

لایەنەکی دی ییێ هەری باش ئەوە کو ئەڤ پەرتووکە ب دیالێکتا کورمانجییا ناڤەڕاست هاتیە نڤیساندن و دەستکاری دتێکستێن شعراندا نەهاتیە کرن، مینا هنەک برادەر هەولا وێ چەندێ ددەن، لێ فەرهەنگۆکەکا پەیڤێن گران تشتەکی فەر و پێویستبوو، هەرچەندە شێوازێ قەدری جانی ب خوە گەلەکێ سڤک و رەوان و ئاسانە لێ هەبوونا دیالێکت و گۆڤەرێن مشە ڤی تشتی فەردکەت. لەورا مرۆڤ دکاریت بێژیت کو ڤێ پەرتووکێ دوو لایەنێن پەرتووکخانا کوردی (کورمانجییا باکوور- کورمانجییا ناڤەڕاست) پڕ کرنەڤە ژ بەرهەمێ ڤی شاعری، کو دخوینا مللەتێ خوە دا دژیت.

بەرە پێشین دەستخوەشییێ ژ نڤیسکاری دکەم، و هیڤیا دەمێن پڕ مفا و بەختەوەری بۆ خوبندەڤانێن ڤێ ئۆغرا پڕ پەندو جام دخوازم.

**ئەحمەد قەرەنی**

**هەولێر ٢٨/٧/٢٠٠٢**

# بەشی یەکەم

## ژیان و بەسەرهاتی قەدری جان

ناوی تەواوی قەدری جان: (عەبدولقادر عەزیزجان)ە، خەڵکی کوردستانی باکوورە، لە سەروکانی رووباری دیجلە، لە گوندی (دێرک)ی سەر بە بناری چیای (مازی)، لە رۆخ کەنارەکانی شاری ماردین، چاوی بە دونیای رووناک و گەش هەڵێناوە، هەر وەکو خۆیشی لەم پارچە هەڵبەستەی خوارەوەدا دەریدەبڕێت:

دێرکا چایێ* مازی
وەلاتێ باڤ و کالە
لێ سەد هاوار و گازی
ژێ دوورکەتم چەند سالە
ئەز ل وێ هاتم دنێ
وێ دەرگوشێ، هەژاندم
هەی واخ هەی مالامنێ
دژمنان، ژێ رەڤاندم (١)

شاعیر هەر لە گوندی ناوبراو دەست بەخوێندن دەکات ودوای تەواو کردنی خوێندنی سەرەتایی، روو لە شاری ئەزمیر دەکاو لەوێدا درێژە بە خوێندنی خۆی دەدات، تاوەکو لەگەڵ هەڤاڵی زێدی

* چایێ: واتە چیا شاعیر زۆرجار ئەم وشەیەی بەم شێوەیە بەکارهێناوە.
١- نەوزاد، دێرک، گ: هاوار، ژ: ٢٤، شام، ١٩٣٢، ل٧ .

خۆی (رەشیدێ کورد ١٩١٠-١٩٦٨) بڕوانامەی مامۆستایی (دارالمعلمين) لە ئەزمیر بەدەست هێنا، پاشان لەئەسکەندەرونەو ئەنتاکییێدا وەک مامۆستا دادەمەزرێت.

ئەگەر چاوێک بەو وتارو نووسینانەدا بخشێنین، کە لەسەر قەدری جان نووسراون، دەبینین لەبارەی ژیان و لەدایک بوونی گەلێک راوبۆچوون هەن کە تاوەکو ئێستا بە شێوەیەکی بابەتییانە بۆمان ساغ نەبۆتەوەو خۆیشی بە شێوەیەکی راستەوخۆ ئاماژەی پێ نەکردووە، ئەگەر چی لەو هەڵبەستەی سەرەوەیدا باس لە ژیان و بەسەرهاتی خۆی دەکات، بەڵام هیچ ئاماژەیەک بە مێژووی لە دایکبوونی خۆی ناکات.

جا لێرەدا بەپێویستی دەزانم ئەو راوبۆچوونانە بخەمەبەرچاو کە تاوەکو ئێستا گوتراون، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی بابەتی و زانستی مێژووی لەدایکبوونی روون بکەمەوە.

یەکێ لەو نووسەرو رۆشنبیرانەی کە باس لە ژیان و دایکبوونی دەکات خانمی رۆشنبیرو ناسراوی کورد (رەوشەن بەدرخان)ە کە لە کتێبەکەی خۆی:(صفحات من الادب الكردي)دا دەڵێت: «قەدری جان هەڵبەستڤانەکی نوێخوازو پەیڤ و رامان نازکە، ساڵی ١٩١٦ لە کوردستانی تورکیا لەدایکبووە). [٢] دکتۆر (عیزەدین مستەفا رەسووڵ)یش هەمان بۆچوونی سەرەوەی هەیە، بەڵام لەپەراوێزی یەکێک لە وتارەکانیدا کە ساڵی ١٩٧٢ بەناونیشانی (بۆ مەرگی قەدری جان)، لە رۆژنامەی (ژین) بڵاوی کردۆتەوە، دەڵێت:

٢- روشن بدرخان، صفحات من الادب الكردي، بيروت، ١٩٥٤، ص٥٨

«لەهەندێ شوێندا ساڵی لەدایک بوونی بە ١٩١٦ دانراوە، ئەمە ئەگەر تەواویش نەبێ لە راستییەوە نزیکە»(٣).

هەروەها (ئەدیب نادر)یش رایەکی تری هەیە کـــە دەڵێت: «قەدری جان لەساڵی ١٩١١ لە دایک بووە»(٤) دیسان نووسەر (رەڤەند توڤی)ش هەمان رای هەیە.(٥) مامۆستای خوالێخۆشبوو (مستەفا نەریمان)یش لەسەر ئەم بابەتە رای خۆی هەیە، و دەڵێت: «قەدری جان لە ساڵی ١٩١٤ لە دایک بووە»(٦). «ڤازگال بازید»یش دەستی لە ژیان و بەسەرهاتە تەمومژاوییەکەی شاعیر هەڵنەگرتووە، کە بە راشکاوی دەڵێت: «قەدری جان لەساڵی ١٩١٣ لەدایک بووە».(٧)

بەڵام (دلاوەرێ زەنگی) وتارێکی لەسەر شاعیر نووسیوەو بە شێوەیەکی زیرەکانە خۆی خستۆتە ناو قووڵایی بەرهەمەکانی شاعیرو لەئەنجامدا چیرۆکێکی، بە ناوی (سەرئەنجام)هەڵبژاردووە کە لە ساڵی ١٩٤٣لەلان شاعیرەوە بڵاوکراوەتەوە تیایدا زەنگی ئاماژە بەوە دەکات کە قەدری جان بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ مێژووی لە دایک بوونی خۆی تۆمار کردووە، کاتێک شاعیر

٣- دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ، بۆ مەرگی قەدری جان، ر: ژین، ژ: ٨٤، ١٩٧٢ ٤- ادیب نادر، بین البارزاني و قدریجان، مجلة: (مەتین)، العدد: ٣٠، دهوك، ١٩٩٤، ص٧٠ .

٥- رەڤەند توڤی، قەدری جان، گۆڤارا: مەتین، ژ: ١٤، دهۆک، ١٩٩٢، ل١٩ .

٦- مصطفی نەریمان، بۆ سوودی گشتی، گ: رۆشنبیری نوێ، ژ: ١٢٧، ١٩٩١ ل١٣٤ .

٧- ڤازگال بازیدی، وەلاتپارێزێ دلسۆز قەدری جان، و:مصدق توڤی، ر: پەیمان، ژ: ٤٧، دهۆک، ١٩٩٦ .

دەڵێت: «ئەو پەلێن کو ژ کتێبا ژیانا من هاتنە چڕاندن، ئیرۆ پەرچێن وان یێ رزیایی بەرەڤەدکەم، ب هەڤ دزەلقینم... دخوازم ژ وان، کتێبا بەختیاریێ چێبکەم. سۆند... گونەه... رۆژێن دەرباسبوویی... سەرئەنجام... هەر یەک ژڤان، ژ کتێبا ژیانا منا حەزین رووپەلەکی رەنگینن. لێ رەنگین دبن، زەنگین دبن... دیسان پەلێن چریایی و رزیایی نە... سەرئەنجام ژی رووپەلەک ژ وان پەلانە...».[٨] ئەوەی جێگای سەرەنج بێت لەم رستانەی سەرەوەدا ئەوەیە کە هەموو بەرهەمەکانی قەدری جان رەنگدانەوەی ژیان و بەسەرهاتەکانییەتی هەر وەکو لە چیرۆکی سەرئەنجامدا، کە بەسەرهاتی مردنی براکەی خۆی بە ناوی «فەتحی» دەگێڕێتەوەو لە سەرەتاکەیدا دەڵێت «بەری بیست وپێنج سالان بوو»[٩] کە رووداوەکە روویداوە، پاشان درێژە بە چیرۆکەکە دەدات و دەڵێت: «تەمەنم لەنێوان ٦-٧ سالی دەبوو»[١٠] ئەگەر ئێمە بۆ بیست و پێنج ساڵ بگەڕێینەوە، واتە لەساڵی ١٩٤٣وە بەرەو پاش، بەلێکدانەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا براکەی لەساڵی ١٩١٨ کۆچی دوایی کردووە، بە دەرکردنی ٦-٧ ساڵ لە ساڵی (١٩١٨)دا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە قەدری جان لە نێوان ساڵانی (١٩١١-١٩١٢)دا لەدایک بووە، بەپێی ئەم بۆچوونانەی کە باسمان کردن (رەوشەن بەدرخان و د. عیزەدین) بە هەڵە چووینە چونکە من پێم وایە هیچ کەسێک لەتەمەنی دووساڵیدا لە توانایدانییە بیر لەمردنی برای خۆی بکاتەوە. هەروەها رایەکەی (مستەفا

(٨،٩،١٠)- قەدری جان، سەرئەنجام، گ: رۆژانوو، ژ:٢، بیروت، ١٩٤٣، ل٤ . (لاتینی)

نەریمان)یش تارادەیەک لەگەڵ بۆچوونەکەی (ڤازگال بازیدی) نزیکە، بەڵام بەپێی ئەو زانیارییانەی کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردن بۆچوونەکانی ئەمانیش لاواز دەبنەوە، تەنها بۆچوونەکەی (دلاوەرێ زەنگی) بەراست دەزانرێت، چونکە بە قووڵی چووەتە ناو بابەتەکەو راستییەکەی بۆ دەرکەوتووە، جگە لەمەش لەگەڵ بۆچوونەکانی (رەڤەند و ئەدیب) یەکدەگرنەوە، بەڵام من پێم وایە (رەڤەند توڤی) بۆچوونەکەی لەسەرچاوە نوێیەکان وەرگرتووە، بەبەڵگەی ئەوەی لەو دووسێ وتارەیدا کە لە رۆژنامەی هاوکاریدا لە مەڕ قەدری جان بڵاویکردونەتەوە، ساڵی لەدایک بوونی بە ١٩١٦ داناوە، کاتێ بڵاوکردنەوەی گۆڤاری هاوار کە یەکەم ژمارەی لە ساڵی ١٩٣٢ بڵاوکراوەتەوەو قەدری جان بەشداری تێدا کردووە، جابەپێی ئەم ساڵە واتە «١٩١١-١٩١٢» تەمەنی شاعیر ٢١ ساڵ بووەو لەو تەمەنەشدا، دەتوانین بڵێین تەمەنێکی شیاوە بۆ هەبوونی بەهرەی داهێنانی هزری و بڵاوکردنەوەی نووسین.

بۆ زیاتر سەلماندنی ئەم رایەش زمانزان و شاعیری کورد «رەشیدێ کورد» کە لەگەڵ قەدری جان خەڵکی یەک گوندبوون و هەڤاڵی خوێندنی بووە، لە ساڵی ١٩١٠ لە دایک بووە، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە تەمەنیان لەیەک نزیک بووە.

لە ئەنجامی تاوتوێکردنی ئەم هەموو راو بۆچوونانەی کە پێشتر هەر کەسێ بەپێی زانست و تەقەلای خۆی ئاماژەی بۆ ژیانی و بەسەرهاتی قەدری جان کردووە، ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە لە ساڵی ١٩١١ لە دایک بووە.

ژیان و گوزەرانی شاعیر لە ئاستێکی بەرزدا بووە، ئەمەش لەبەر

ئەوەی باوکی بازرگان بووە، لەتەمەنی مامۆستایەتیشدا کچێکی خەڵکی ئەستانبوولی خواستووە، کە ناوی نیلوفەر بووە،[١١] کە دەکاتە کچی «عەلی عوسمان بەگ»و لەبنەچەدا تورکە، لە ١١ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٣٩)ش گواستیتەوە، لە دوای خۆیدا دوو کوڕو کچێکی بە ناوی (مزگێن وسەروەرو شیرین) بەجێ هێشتووە، کە ئێستا شیرین لە سووریا خەریکی کاری نوژدارییە.[١٢]

شاعیر لەو کاتەی قوتابی بووە شەیدای خەبات و تێکۆشانی کوردایەتی بووە، بۆیە خۆی پێ نەگیراوەو لەگەڵ هەڤاڵەکەی (رەشیدێ کورد) بەرەو جزیرە دێن، بۆ ماوەیەکی کەم لەوێ دەمێننەوە، پاشان بەرەو سووریا دەکەونەڕێ، لەسەر مێژووی هاتنی قەدری جان بۆ سووریا گەلێک رابۆچوون هەن، هەندێکیان ساڵی ١٩٣١،[١٣] ١٩٢٩،[١٤] ١٩٢٨،[١٥] یان بۆ داناوە، بەڵام شاعیر لەیەکێک لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا ناڕاستەوخۆ ئاماژە بەم مێژووە دەکات و لە ١٨ی حوزەیرانی ١٩٥٢ دێنێتە بیری خۆی و دەڵێت: «بیست وپێنج ساڵ لەمەوبەر خۆم لەئامێزی سیاسەتا بینییەوە، لەبەر ئەوەی ناچاربووم لە باوک وبرایەکانم

١١- ڤازگال بازیدی، سەرچاوەی پێشوو.

١٢- دلاوەرێ زەنگی، هەلبەستڤان و نڤیسەرێ داهێنەر قەدری جان، و: محەمەد عەبدوڵلا، گ: رامان، ژ: ٥٤، ٢٠٠١، ل٣٧ .

١٣- اسماعیل بادی، قەدری جان.. هەڤبەندی.. و هوزان، گ: گازی، ژ: ٣٢، دهۆک، ١٩٩٧، ل٣١ .

١٤-شعبان مزیری، «قەدری جان» ئوکارێ داهێنانا هوزانێ، گ: رۆشنبیری نوێ، ژ: ١٤٣، ١٩٩٩، ل ٧٤ .

١٥- دلاوەرێ زەنگی، سەرچاوەی پێشوو. ل٣٦.

دووربکەومـــەوە، بەرەو شـــاری حـــەســـەک بکەومـــەڕێ»[16]
بەگـەڕانەوەی (٢٥) سـاڵیش بۆ سـاڵی ١٩٥٢ دەردەکـەوێت کـە قەدری جان لە ساڵی ١٩٢٧ لە کوردستانی تورکیا بەرەو سووریا هاتووە، بەپێی ئەم سەلماندنە هەموو ئەو راوبۆچوونانەی سەرەوە لە راستـی دوور دەخـرێنەوە، جگەرخـوێنیش لـەم بارەیەوە دەڵێت «ئەم هەردوو گەنجە واتە (قەدری جان و رەشیدێ کورد) لە خوێندنی بلند هەلاتبـــوون، لەمـــاڵی قـــەدری بەگ لە حـــەســـەک من ئەوانم ناسی».[17] شاعیر لەسووریا بە ماوەی شەش مانگ فـێری زمانی عـەرەبی دەبێت، بۆیە زوو وەک مـامـۆسـتـا دادەمـەزرێ و پیـشـەی مـامۆسـتـایەتیـشی لە زۆر شوێندا، وەک:(سەلیـمیـە، عین العـرب، ئامووێ، قامیشلۆ...)کردووە.

شاعیر پەیوەندی لەگەڵ زۆر لە سەرکردەو رابەرانی کورد هەبووە، جا چ بەبینین یان نامە گۆڕینەوە بێت، وەک پێشەوا قازی محەمەد و بارزانی نەمروعـەبدلرەحمان قاسملو، هەروەها دۆست و هەڤاڵی مـەمدوح سەلیم بوو، کە ئەندامێکی کارای دامەزرێنەری کۆمەڵەی خـۆیبـوون بـوو، بۆیە مـاڵی شـاعـیـریش بووەتە لانەی کـوردایەتی و قـوربانی دان، بەڵگەش بۆ قسـەکـانم ئەوەیە کـاتێک کـە کوڕەکـەی باسی ژیانی باوکی دەکـات دەڵێت: «قـاسـملو ژی وەختـەکی رەڤی بوو، ل مالا باڤێ من بوو مێڤان»[18] واتە ئەوکاتەی رایکردبوو لە

١٦- حوسێن حەبەش، راپەڕینا چاندا کوردی دگۆڤارا هاوارێ دە، بەلاڤگەها هۆگربۆنن، چ١، ١٩٩٦. ل٤٧. (لاتینی)
١٧- جگەرخوین، ژینە نیگارا من، ئاپەک، ستـۆکـهـۆڵم، ١٩٩٥، ل ١٩٧ (لاتینی)
١٨- ڤازگال بازیدی، سەرچاوەی پێشوو.

ئێران بەو مانایەی ماڵەکەی وەکو بنەماڵەکانی دیکەی کورد بووەتە پەناو حەشارگەی قارەمانانی کورد. مامۆستا شوکر مستەفا دەڵێت: «لەو کاتەی کەمن لە سووریا بووم لەساڵانی نێوان (١٩٥٥-١٩٥٦) ئەوەی من دیقەتم دەکرد لە کوردەکانی سووریا لە هەموویان زیاتر قەدری جان و د. نورەدین زازا کوردایەتیان دەکرد، کوردپەروەربوون، بەتایبەتی قەدری جان کە زۆر پاک بوو لە کوردایەتییەکەی»[١٩] شاعیر لەساڵی (١٩٥٠)دەستی لەمامۆستایەتی هەڵگرتووەو لە وەزارەتی پەروەردە بووەتە سەرپەرشتیار.[٢٠]

لەکاتی یەکبوونی میسرو سووریا، لە کارمەندێتی دوور دەخرێتەوە، ساڵی (١٩٥٧)لەگەڵ «کۆمەڵەی لاوان»ی سووریا جێگای خۆی دەگرێ و دەچێت بۆ ڤیستیڤاڵی شەشەمی لاوان لە مۆسکۆ، ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە ناساندنی دۆزی کورد بە جیهان، هەر لەم گەشتەدا، بەپێویستی زانی چاوی بە سەرۆکی نەتەوەی کورد (مەلا مستەفای بارزانی) بکەوێت، کە لەوکاتدا ئاوارەی ئەوێ بوو سەردانی بارزانی کردو شیعرێکیشی بە ناوی «سەرداریێ کوردا... بارزانی»* پێشکەش کرد.[٢١] بارزانی ئەم هەڵبەستەی لەلای خۆی

١٩- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ ڕێزدار مامۆستا شوکر مستەفا ٢٨/١٠/٢٠٠١.

٢٠- ڤازگال بازیدی، هەمان سەرچاوە .

* ئەم شیعرە لە ساڵانی پەنجاکان لە لایەن «شەماڵ سائیب»ەوە کراوەتە بەسروود، شەماڵ سائیب ئەم هەڵبەستەی لە دکتۆر عیزەدین وەرگرتبوو، دکتۆر ئەم بیرەوەرییە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: «لەساڵانی پەنجاکان ڕۆژێکیان لەناو بازاڕی بەغدا بەخزمەت هونەرمەند شەماڵ سائیب گەیشتم دوای چۆنی و چاکی پێم گوت کاک شەماڵ بۆچی ئێستا بەرهەمت کەمە، ئەویش لەوەڵامدا گوتی: «ماشاڵڵا شاعیرانمان شیعری خۆیانمان نادەنێ، بۆ ئەوەی بیکەین بە گۆرانی»

پاراست و هێژا (مەسعود بارزان)یش لە پەرتووکەکەی خۆیدا «البارزاني والحركة التحررية الكردية، ج٣» بڵاوی کردۆتەوە.

شاعیر خەباتێکی دوورودرێژی هەبووە، بەشداری لەچەندین کۆمەڵە و ڕێکخستنی کوردایەتی کردووە وەک: (کۆمەڵەی خۆیبوون)، هەروەها دۆستایەتی و پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵەی (هیوا)و تەنانەت لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقیشدا هەبووە، لە ساڵی (١٩٥٠) بووەتە سکرتێری کۆمەڵەی (پێشڤەچوون)، ساڵی (١٩٥٧) ئەم کۆمەڵەیە دەگۆڕدرێ و پارتی دیموکراتی کوردی سووریای لێ دروست دەبێت. هەر لەم ساڵەدا دەست لەکاری سیاسی بەردەدات، بەڵام مەیدانی خەبات وتێکۆشانی کوردایەتی چۆڵ ناکات.(٢٢)

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ دەڵێت: «قەدری جان دۆستێکی پتەوو نەگۆڕاوی کۆمۆنیستەکان بوو، بەڵام نەچووە ناو پارتی کۆمۆنیستەوە»(٢٣) شاعیری ناوداری کورد (جگەرخوێن)یش لەو

وتم شیعرێکی خۆشی قەدری جان لەسەر سەرکردەی کورد بارزانیی لەلامە، ئەگەر دەتەوێ بیکەی بە سروود دەت دەمێ. شەماڵیش وتی لەوە چاکتر نییە، شیعرەکەی وەرگرت ورۆیشت ماوەیەکی پێچوو، شیعرەکەی کرد بە سروود و لە ڕادیۆ گوێم لێ بوو، بەڵام لەکاتی گوێ گرتنم، هەستم کرد دەستکاری شیعرەکەی کردووە، دوایی چاوم پێی کەوتەوەو پێم گوت کاک شەماڵ بۆچی دەستکاری شیعرەکەی قەدری جانت کردووە، لەوەڵام دا گوتی: «بە خوای کاکە وشەکان لەگەڵ ئاوازەکە نەدەهات بۆیە دەستکاریم کردووەو هەروەها تاوەکو خەڵکی ئێرەش زیاتر تێ بگەن». ئەم وتانەم لە هێژا بەکر شاکر کاروانی مامۆستا لە زانکۆی سەلاحەدین وەرگرتووە کە خۆی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ دکتۆر کردووەو ئەم گوتانەی لە ڕۆژی ١٩٩٩/٢/٢٨ لەسەر کاسێت تۆمارکردووە، لەو کاتەی خەریکی نووسینی ماستەر نامەکەی خۆی بوو.

٢١- اديب نادر: المصدر السابق، ص: ٧٢ .

٢٢،٢٣- دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، سەرچاوەی پێشوو.

بارەیەوە دەڵێت: «گەلەک جاران شەڕێ من دکرو دگۆت: چاوا شەڕی بەگ و ئاغا دکەی؟ تە دەڤ ژ ملەتپەروەری بەردایەو بوویە کۆمۆنیست لێ ڤێ پاشی بوو بوو دۆستێ کۆمۆنیستان»[٢٤] بەڵام پرۆفیسۆر (قەناتی کوردۆ) ئەمە بە راست نازانێ و دەڵێت: «قەدری جان ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردی سووریا بوو».[٢٥] مامۆستا (شوکر مستەفا) سەبارەت بەم بابەتە دەڵێت: (قەدری جان (کۆمۆنیست) نەبوو، چونکە رۆشنبیرانی ئەوێ واتە سووریا زۆر هاتووچۆی ماڵی (رەوشەن بەدرخان)یان دەکرد، ئەوانەی نەدەهاتن تەنها شوعییەکان بوون چونکە ئەوان پێیان وابوو ئەم بنەماڵەیە لەگەڵ فرەنسیزەکان دەستیان تێکەڵ کردوەو جاسووسییان بۆ دەکەن، جا ئەگەر قەدری جان شیوعی بوایە، نەدەهاتە ماڵی رەوشەن بەدرخان، کەچی بەپێچەوانەوە قەدری جان زۆر هاتووچووی ماڵی رەوشەن بەدرخانی دەکرد.)[٢٦] بەپێی ئەم تێڕوانینانە ئەو گەواهییەمان بەدەستەوەیە کەوا قەدری جان کۆمۆنیست نەبووە بەڵکو پێشکەوتن خوازو دیموکرات خواز بووە.

لە نێوان ساڵانی (١٩٥٩-١٩٦١) لەسەر خەباتی کوردایەتی دەستگیرکراوە و بۆماوەی سێ ساڵ لەبەندیخانەی (مەزە)دا زیندانی کراوە، جگەرخوێنیش دەڵێت: «قەدری جان دوویان سێ جار کەوتۆتە ناو بەندیخانە».[٢٧]

٢٤- جگەرخوین، سەرچاوەی پێشوو ،ل ١٩٨.
٢٥- پ. قەناتی کوردۆ، تاریخا ئەدەبیاتا کوردی -١- سوێد- ١٩٨٣- ل١٨٦ .
٢٦- بروانە پەراوێزی ژمارە (١٩).
٢٧- جگەرخوین، سەرچاوەی پێشوو. ل١٩٨.

بەڵام دەبێ ئەم ئامـاژەیە، بەحـەزەرەوە وەربگرین کـە کـوڕەکـەی دەڵـێـت: «بـاوکـم هـیـچ جـــــارێـک نـەبـۆتـە، ئەنـدامـی پـارت و رێکخسـتنان، دیسان لەسەر ئەم پرسیارە، کاتی باوکم زۆرکەم بوو، لە مـاڵەوە بە دووردرێژی قسـە بۆ ئێـمـە بکات». (٢٨) من پێم وانییە زاناو پسـپۆڕێکی وەها رۆڵی سیاسی نەگێڕابێ بەتایبەتی کـاتێ کـە پەیوەندی بە پارتە سـیاسـیـەکانەوە کـردووە. سـەرەڕای ئەمـەش ئەگـەر باش لە قـسـەکـانی کـوڕەکـەی وردبینەوە بۆمـان دەردەکەوێت کە کوڕەکەی ئاگای لە کاری سیاسی باوکی نەبووە، چونکە کاری سیاسی ئەوکات بەئاشکرا نەدەکرا کە بەمانایەکی تر دەتوانین بڵێین قەدری جان نەیتوانیوە کارە نهێنییەکان لەنێوان ئەندامانی خێزانەکەی بدرکێنێ.

ساڵی (١٩٥٨)، لەو کاتەی بارزانی نەمر لەیەکێتی سۆڤیەتی پێشوو گەڕابووەوە باوەشی وڵات، قەدری جان دەبێتە میوانی و بەم بۆنەیەشەوە هەڵبەستێکی بە ناوی «شێری وڵات، بارزانی هات» بۆ رێز لێنان و پێشوازی کردن لە (بارزانی) دەهۆنێتەوەو لە گۆڤاری (هیوا)و رۆژنامەی ئازادی بڵاوی دەکاتەوە، لە هەمان کاتدا هەست دەکـات کـە بزاڤی ئەدەب و نووسـینی زمـانی کـوردی لەبەرەو پێـشـچـووندایە زۆر خـۆشـحـاڵ و کـامـەران دەبێ، (٢٩) هەروەها رۆڵێکی گـەورەی بینیـوە، لەبەرەو پێش بردنی ئەدەبیـاتی کـوردی شان بەشانی ئەدەبیاتی جیهانی بە تایبەتی لە ساڵانی سییەکاندا،

٢٨- ڤازگال بازیدی، سەرچاوەی پێشوو.
٢٩- اسـمـاعـیل ابراهیم مـحـمـد صـالح، قـەدری جـان و هوزانا کـوردییـا هەڤچەرخ، گ: کاروان، ژ: ٢٧، ١٩٨٤، ل ٣٣ .

که خامەی شاعیر وەک سەرەڕمێک لەهێڵەکانی پێشەوەی بەرەی خەباتدا دەجەنگا.

کاتێک گۆڤاری (هاوار) بەڕابەرایەتی (جەلادەت بەدرخان). دەرچوو شاعیر وەک نووسەرێک کەوتە گۆڤەندی نووسین و بەباشی ئەسپی خۆی لەم مەیدانەدا تاوداو بەچیرۆک و شیعرو وتار، رووپەلەکانی رازاندۆتەوە، هەروەها نازناوی (نەوزاد)ی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو[٣٠] چەندین شیعری بەم ناوە بلاوکردۆتەوە، ئەم بەشداری کردنە بووەتە سەرچاوەیەکی گرنگی رۆشنبیری شاعیر، هەروەها گەلێک زمانیشی زانیوە، جگە لە زمانی کوردی کە بەهەردو شێوازی سەروو و خواروو، زمانی تورکی و عەرەبی و فەرەنسی و رووسیشی زانیوە.

ساڵی (١٩٧١) خانەنشین دەبێ و دوای چەند مانگێک، واتە لە ئابی ١٩٧٢/٨/٩[٣١] بە هۆی (نەخۆشیەکی کتوپڕ) کۆچی دوایی دەکات و لە گۆڕستانی شێخ خالیدی نەقشبەندی لە دیمەشق بەخاک سپێردراوە، لەسەرکێلی گۆڕەکەشی ئەم پارچە هەڵبەستەی عیزەت ئاغایێ دێرکی[٣٢] نووسراوە:

جەندەکێ د ڤێ گۆڕی دا

٣٠- گۆڤاری پەلین، ژمارە: ٥، ئەستەمبوڵ. ساڵی ٢٠٠٠، ل٤ . (لاتینی)

٣١- د، عزالدين مصطفى رسول، بكائية الى قدري جان، جريدة التأخي، العدد ١١٢٦، ١٩٧٢ .

٣٢- حەسەن هشیار، قەدری جەمیل پاشا، گ: وان، ژ: ٦، سوێد، ١٩٩٣، ل١١ . (لاتینی)

زۆر نـازک و جـــــــوانـه
ژدێرکـــا چیـــایێ مـــازی
ناڤێ وی قـــەدری جـــانه
هەزار خـــوەسی ل گـــۆڕا وی
هـۆزانـەکـی کـــــــوردانـه
وەلاتپـــارێزەکی قـــەنج بوو
رۆهســـتین ژێ گـرتی جـانه
گـۆرێ خـــســـتـه زکی خـوە
ئەو ژی کـــــرە قـــــوربانـه
ژ پشـــتـا مـــە کـــوردان چوو
ئـەڤ زانایـێ زمـــــانه[٣٣]

وەک زۆربەی هەرە زۆری شـاعـیـرانی سـەردەمی خـۆی، تاڵی و سـوێری و ژیانی ئاوارەیی و دوورە وڵاتی چێـشـتـووە، بیـری کوردایەتی هێلانەی لەمێشکیدا دروست کردبوو، هەرگیز لە خەباتی سیـاسی مـیللەتەکەی خۆی دوورنەکەوتۆتەوەو هەر لەبەر ئەمەشـە دەبینین راوەدونـان وزیندان و ئـاوارەیی ودوورە وڵاتی چنگی پێ هەڵچنیوە، بەڵام ئەو هەمیشە کۆڵی نەداوە، تا کوردیش مابێ ناوی قـەدری جان بەپیـتی زێڕین و بە درەوشـاوەیی لە نێـو لاپەڕەکـانی مێژووی ئەدەبی کوردیدا تۆمار دەکرێت.

٣٣- ڤازگال بازیدی، سەرچاوەی پێشوو.

## قەدری جان و ئەدەبیاتی تازەی کرمانجی ژووروو

کاتێک کە باسی تازەگەری لە شیعرو ئەدەبیاتی کوردی کرمانجی ژووروو دەکەین، دەبێ نەختێک بۆ دواوە بگەڕێینەوەو بزانین کێن ئەو شاعیرانەی کەبۆ یەکەم جار نووکی خامەیان خستە کارو شیعری نوێیان پێ نووسی ورووپەلەکانی ئەدەبیاتەکەمانیان رازاندەوەو ئەو کەلێنە گەورەیەی ئەدەبیاتی کوردییان پڕکردەوە، یەک لەو شاعیرە مەزن و ناودارانەش «عەبدول رەحیم رەحیمی هەکاری (١٨٩٠-١٩٥٨)یە، کە لە ساڵی (١٩١٨) توانی ئاڵای تازەکردنەوە بەرز بکاتەوەو چەندین پارچە شیعر لە گۆڤاری ژین (١٩١٨-١٩١٩) بڵاو بکاتەوەو بناغەی ئەدەبیاتی تازەی کوردی کرمانجی ژووروو دابڕێژێت و ببێتە سەر ئامەدی ئەدەبیاتی تازەی شیعری کوردی.

بەڵام هەندێکی تر لە شاعیران توانییان ئەم گۆڕانکارییە پەرەپێبدەن و بەرەو پێشەوەی ببەن و بیگەیەننە لوتکەی هەرەبەرز لەوانیش: (قەدری جان و کامەران بەدرخان) بوون. وەلێ لێرەدا دەمەوێ رۆلی قەدری جان بخەمە بەرچاو، چونکە بە دواداچوون و لێکۆڵینەوەکەمان تایبەتە بە ئەو. دەبێ ئەوەشمان لەبیر بێ کە شاعیر لەسەرەتادا، دەستی بەنووسینی شیعری کلاسیکی کردووە، بەڵام توانی ئەو قەیدو زنجیرانەی شیعری کوردییان پابەنکردبوو بشکێنێت و شیعری کوردی لەو کۆت و بەندانە رزگاربکات کە ئەمە خۆی لەخۆیدا بەشۆڕشێکی گەورە دەژمێردرێت بەسەر شیعری

کلاسیکی کوردی. ئەوەی شایانی باسە ئەم شۆڕشەش لەژێر کاریگەری شیعری ڕۆمانتیکی تورکی بوو، بەتایبەتی شیعرەکانی شاعیری ناوداری تورک «نازم حیکمەت».[1] سەرەڕای ئەمەش ئەگەر ئاوڕێک لە شیعرەکەی (ئەز دچم مۆسکۆ) بدەین بۆمان روون و ئاشکرا دەبێت کە شیعرەکەی لە ژێر کاریگەری نازم حیکمەت نووسیوە بەتایبەتی دوای ئەوەی هەر خۆیشی لە مۆسکۆ برادەرایەتیان پەیدا کردۆتەوەو یەکتریان پەسەند کردووە، لەم بارەیەوە مامۆستا شوکر مستەفا دەڵێت: «قەدری جان سەقافەتێکی تورکی هەبوو، شارەزایی چاکی لە ئەدەبیاتی کۆنی تورکی هەبوو، واتە کلاسیکی تورکی جگە لەمەش زمانی تورکی زۆر بە چاکی دەزانی».[2] شاعیر کێشی سەربەخۆو خۆماڵی بەکارهێناوەو خۆی لەقافیەی شیعری کلاسیکی دوور خستۆتەوە، هەروەها لەشیعرەکانیدا زۆر جار چاومان بە هەندێ کەڤاڵ و وێنە دەکەوێت، کە بە وشە جوانەکانی زمانی کوردی کێشاویەتی، تەنانەت توانی بەزمانێکی وابنووسێت کە هەموو دەڤەرەکانی کوردستان لە هەڵبەستە شیرینەکانی تێبگەن،واتە زمانی شیعری قەدری جان زمانێکی یەکگرتووی کوردی بوو، ئەمەش بە ئاشکرا لەشیعرەکانی رەنگیداوەتەوە.[3]

١- دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، چ (خوێندنی باڵا)، هەولێر، ١٩٩٠ ل ١٦٠.
٢- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ ڕێزدار مامۆستا شوکر مستەفا لە ڕێکەوتی ٢٨/١٠/٢٠٠١.
٣- دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ، بۆ مەرگی قەدری جان.ر: ژین، ژ: ١٩٧٢،٨٤.

دکتـۆر عـیـزەدینیش دەڵێت: «هۆنراوەکانی قەدری جان بەزمانێکی کوردیی ساکار نووسراون، بەڵام پاراو و جوان و رەوان، ئەوەی جوانیشی بەو وشە ساکارانە بەخشیوە، ئەو موسیقای شیعرەیە کە هونەرمەندانە دەنگی شاعیرانەی قەدری جانی بەرزکردۆتەوەو وشەکانی لەگەڵ یەکدا کردووە بە ئاوازێکی یەکگرتووی دەنگدار، کە لە هەر باس و شوێندا ببێ بەدەنگ و موسیقای ئەوباسە».(٤) راستە قەدری جان بە کوردییەکی رەوان و پەتی وشەی ساکاری بەکارهێناوە، بەڵام مانا و هزری قووڵیان بەخۆوە گرتووە، بەڵگەش بۆ قسەکانمان ئەو دوو هەڵبەستەیە کە بە ناوی «ریباتازە و بەگێ ئاخر زەمان» هۆنیویەتەوە، جگەلەمەش شیعرەکانی تام و چێژێکی تایبەتی و وێنەی جیاوازییان تێدایە کە جیاوازییەکی زۆریان هەیە، لەگەڵ هۆنراوەی شاعیرەکانی تر.

نووسینی شیعری تازە لەلایەن شاعیرەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی سییەکان کە لەگەڵ شاعیرانی سەردەمی خۆی وەک: «جگەرخوێن و عوسمان سەبری... تاد» لە هەموو ئەو گۆڤارانەی کە لە سووریا و لوبنان دەردەچوون تیابەشداربووە، پرۆفیسۆرو زانای کورد قەناتی کوردۆ لەم رووەوە دەڵێت: «ناوودەنگی قەدری جان بە ناوودەنگی جگەرخوێن و عوسمان سەبری گرێ دراوە، راستی وتووە لە نووسینەکانی خۆیدا ئەو نەقاسی وانە، ناگێژەوان... ئەویش وەک هەردوو شاعیرانی تر، ل سەری چیایێن کوردستانی دەنگی خۆی بەر بەکچ و گەنجان کردووە، لە شیعرو چیرۆک و سەرهاتییەکانی خۆیدا».(٥)

٤- هەمان سەرچاوە.
٥- پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ، تاریخا ئەدەبیاتا کوردی- ١- ستۆکهۆڵم- سوێد- ١٩٨٣، ل ١٧٧ . (لاتینی)

لە نێوان ساڵانی (١٩٣٧-١٩٣٨)دا شاعیر شیعرەکانی خۆی لە ناو هەموو چینەکانی میللەتی کورد بڵاوکردوونەتەوە، بەتایبەتی لە نێو شاگردەکانی (فەقێیەکانی) مزگەوت و قوتابییەکانی قوتابخانە، لەوکاتەی ببوو بە مامۆستا لەقوتابخانەی (ئیندیواریێ). ئەو شیعرانەش بەبەرگێکی نوێ و بە کێشێکی سەربەست دارێژرابوون.

بێگومان هەموو تازەگەرییەک لەهەر شێوەیەکی ژیاندابێ لە سەرەتادا تووشی گلەو گازاندەی زۆر دەبێت، قەدری جانیش وەک یەکێک لەپێشڕەوانی تازەگەری و خاوەن قوتابخانەیەکی تازەی شیعری، تووشی ئەم گلەو تانانە بووە، لەم بارەیەوە، شاعیری ناوداری کورد سەبری بۆتانی (١٩٢٥-١٩٩٨) دەمەقاڵێیەکی نێوان قەدری جان و فەقێیەکمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: «رۆژێکیان فەقێیەک هاتەلای قەدری جان و پێی گوت: «توخوا قەدری ئەفەندی ئەمە چی بوو؟ چ نووسینێک بوو؟ لەگەڵ شیعرەکانی جگەرخوێن و ئەحمەد نامی بۆ ئێمەت ناردبوو؟..» قەدری جان گوتی: «ئەویش شیعرە، شیعری نوێیە، هی منە، من بەم شێوەیە شیعر دەنووسم، بۆ چییەتی؟ تۆ چۆنی دەبینی فەقێی دەلال؟» فەقێش گوتی ئەی بۆچی ناوی خۆت لەسەر نەنووسیبوو؟ یان تۆش باوەڕت پێ نییە؟ خوا وەکیلی تۆبێ سەیدا یەکێک گوتی: ئەمە شیعری منداڵانە، یەکێکی دیکە دەیگوت ئەمە یەکەم جارە شیعری بێ لێوولووت ببینم، یەکێکی دی گوتی ئەمە پێشێل کردنی شیعرە، هەندێکی دیکە دەیان گووت: مخابن ئەو کاغەزەی کە لەسەری نووسراوە، لە ناویاندا هەبوون دەیانگوت ئەو دەستە

بشـكێ کـه نووسـیـویەتی، تەنیـا دووکـەس گـوتیـان: «بەراسـتی بەگـوتنێن خـو خـوەش. بەڵام خۆزگـه شـیـعـر بوایه!!». قـەدری جـان رەحـمـەتی پێکەنی و وتی: «کـورۆ بابۆ سـتـرانێن ئێـمـەش بەم شێوەیەن ما سترانێن مەچاوانن؟ خۆتان شاش مەکەن...». (٦)

لێـرەدا قـەدری جان ویسـتـوویەتی هزرو بیـرەکـانی خـۆی بەهۆی شـیـعـرەوە لەنێـو چینی رۆشنبـیـرانی کـورد بڵاوبکاتەوە بۆیە، (تومـابوا)ش لەسەر ئەم بابەتە دەدوێت و دەڵێت: «قەدری جـان لە رێگای بابەتەکانییەوە، رێگای بۆ خوێنەرانی خۆش دەکرد، کە بیری نوێ وەربگرن». (٧)

شـاعـیـر جێگـایەکی بەرزوگـرنگی لە نـاو ئەدەبیـاتی کـوردیدا، گـرتووە، هەروەها دەتوانین بڵـێین قـەدری جـان پێش هەڤـاڵەکـانی شیعری نوێی نووسیوە، کەلە هەڤپەیڤینێکدا، شاعیری ناوداری کـورد مـامـۆسـتـا گـۆران دان بەو راسـتـیـیـە دەنێ، هەروەکـو دەڵێت: «کـاتێ من و شـێخ نووری و رەشـیـد نـەجیب ئەم جۆرە شـیـعـرەمـان دەنووسی، ئیـتـر من بـەتەنیـا بەکـۆشـشی ئەوان نەوەسـتـام و وەزنی هیـجـائیـشم وەرگـرت و بەکـارم هێناوە، هەر لـەو کـاتەشـا لە سـوریا کامەران بەدرخان و قەدری جان لە رووی هەستێکی نەتەوایەتییەوە هەڵبـەسـتی هیـجـائیـیـان دائەناو لە گـۆڤـاری (هاوار)دا، بڵاویان

٦- سـەبری بۆتانی، جگەرخـوێن ل عـێـراقێ، گ: نووسـەری کـورد، ژ ٦، ١٩٨٨، ل١٧٢.

٧- تومـابوا، مع الاکـراد، ت: آواز زنگنه، مطبـعـة دار الجـاحظ، بغـداد، ١٩٧٥، ص١٥٥.

ئەکردەوە».[٨] ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بۆ سەلماندنی قسەکانمان کە شاعیر لە مەیدانی تازە کردنەوەی هەڵبەستی کوردی چ لە رووی ناوەڕۆک چ لە رووی فـۆرم و تەکنیک و زمـانەوە بەیەکێک لە رابەرانی نوێ کردنەوەی شیعری کوردی دادەنرێت. ڕۆژهەلاتناسی فەڕەنسی (ڕۆژێ لیسکۆ)ش دەڵێت: «ئەوەی تایبەتە بەلایەنی نوێ کردنەوەی شیعری کوردی لە رووی شێوازو ناوەڕۆک و زمانەوە، دەتوانین بڵێین قەدری جانیش هاوشانە لەگەڵ هەرسێ شاعیری کورد (شێخ نووری و پیرەمێرد و گۆران)»[٩] هەروەها دەبێ وتەکەی ڕەوشەن بەدرخانیش لەبیر نەکەین کەدەڵێت: «قەدری جان خوێندنگەهەکا نوی یا دانای د شیعرا کوردی دا».[١٠]

لە پێشەوە ئاماژەمان بە شیعرێکی شاعیر کرد بە ناوی «بەگێ ئاخرزەمان»لەم شیعرەدا، هەموو ئەو داب و نەریتانەی کە کۆمەڵگای کوردەواری پێوەیان پابەندبوو دەخاتە ژێر نەشتەری ڕەخنەوە، (ادریس محمد علی)یش دەڵێت: «قەدری جان کە زانی بەکارهێنانی شێوازە کۆنەکان لەگەڵ ناوەڕۆک شتێکی نەگونجاوەو لەتوانای شێوازە کۆنەکاندا نییە گوزارشتێکی تەواو و پڕ بەپێستی خۆی لەخەمی زەحمەت کێشان و ناخۆشییەکانی مرۆڤی هاوچەرخ

٨- عبدالرزاق بیمار، دانیشتنیك: لةگةڤ گڎران دا، گ: بةیان، ژ:٢، ١٩٧٠، ل٣.

٩- د. کمال معروف، الحرکة التجدیدیة في الشعر الکردي الحدیث، سوید، ١٩٩٨، ص ٢٤٦.

١٠- ادریس چەلکی، دیدارەک دگەڵ ڕەوشەن بەدرخان، ر: بوتان، ژ: ٤، ١٩٩١.

بکات، له نێو گۆڕانکارییەکانی سەردەمی سۆسیالیستیدا، بۆیە بیری لەوە کردەوە کە شێوازی شیعریش بگۆڕێت بۆ ئەوەی لەگەڵ ناوەڕۆکی نوێدا بگونجێ، لەبەر ئەوە لەسەر شێوازی گۆرانی کوردی شیعری نووسی»[11] هەروەکو لەپێشەوەش دیارمان کرد کە شاعیر لەگوتەکانی خۆیدا، ئاماژەی بەم چەندە کردووە. جگە لەمەش دێڕەکانی لەسەر دەنگەکان دابەش کردووەو لەم کارەیدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە، هەروەکو لە شعرێکی بە ناوی(بەگی ئاخر زەمان)دا دەردەکەوێت.

١١- ادریس محمد علي، الذكرى التاسعة لرحيل قدريجان جريدة: العراق، العدد ١٦٧٤، ١٩٨١ .

**قەدری جان و گۆڤاری هاوار**

گـۆڤـاری (هاوار) خـونچـەیەکی قـەشـەنگی دیکەی بنەمـاڵەی بەدرخـانییـەکـانە، کـە زۆر بە دڵسـۆزی ئەرکـەکـانی خـۆیانیـان راپەڕاندووەو شـوێن پەنجـەیان لە زۆر بواری کـوردایەتیـدا دیارە، لەبەر ئەوەی بەرندی خەباتیان کردووەو هونەرو کولتووری کوردییان ژیاندۆتەوەو بایەخێکی ئێکجار گەورەیان بەم لایەنانە داوە، لەسەر ئەم چەندەش زۆر هەنگاوی پیرۆزیان هاوێشتـووە، وەک: دەرکردنی چەندین رۆژنامەو گۆڤار بەزمانی کوردی و زمانەکانی تری بێگانە، لەمـەشدا خزمـەتێکی بێ پایانیـان بەگـەلەکەیان کـردووە، یەک لەو کارە هەرە گەورانەش دەرکردنی گۆڤاری (هاوار) بوو، کە لە ساڵی ١٩٣٢ لە شـام بڵاویان دەکـردەوە، ئەم گـۆڤـارە رۆڵێکی بەرچاوی لەبەرەوپێش بردن و ژیاندنەوەی کـولتـووری گـەلەکـەمـان هەبووە، کەببووە زەوییەک بۆ چاندنی تۆوی شیعرو چیرۆک و پەخشانی ئەو چاخـانە، هەر بۆیە رۆمـان نووسی هێـژا (مـحـمـد ئوزۆن) دەڵێت: «ئەگـەر ئەم گـۆڤـارە نەبوایە دەبا ئێسـتـا فـاتیـحـە بۆ کـرمـانجی بخوێنین» .(١)

ئەم گـۆڤـارە توانی سنوورە پارچەپارچە کـراوەکـانی کـوردسـتـان ببـەزێنێت و خـۆی بگەێنێـتـە بەردەرگـای هەمـوو نووسـەرێک و رۆشنبـیـرێکی ئەو سـەردەمـەی کـوردسـتـان، لە هەمـوو پـارچەکـاندا

١- ادیب نادر، بین البـارزاني و قـدریجـان، مـجلة (مـەتین) العـدد: ٣٠، دهوك ١٩٩٤، ص٧ .

هەندێ لەو زاناو رۆشنبیرانەش وەک: (گۆران، ئەنوەر مائی، عەبدولخالق ئەسیری، جگەرخوێن، حوسێن حوزنی موکریانی... تاد). بۆیە دەتوانین بەگۆڤاری (یەک پارچەی کوردستانی مەزن) ناوی ببەین. ئەم گۆڤارەش تا رادەیەک لەسیاسەت دووربووە بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو وتارەی جەلادەت عالی بەدرخانە کە بەناوی (ئارمانج، ئاوایێ خەبات نڤیساندنا هاوارێ) کە لەمەڕ ئارمانج و بڵاوکردنەوەی هاوار لە ژمارەی (١)ی گۆڤارەکەدا بڵاوی کردوونەوە واتە، لە گۆڤاری (هاوار) وەک دەڵێت: «هاوار ژ نها پێڤە ب هەر تشتی کو کوردان و کوردایەتی پێ بەندەوارە، دی مژوول ببە ، تنێ سیاسەت ژێ دوورە، خوە نا ئێخە سیاسەتی». [(٢)]

شاعیریش یەکێک بوو لە قوتابییەکانی قوتابخانەی «هاوار» کە پشتگیرییەکی تەواوی لە میر جەلادەت بەدرخان کردووە بۆ دەرکردنی ئەم گۆڤارەو لەبەکارهێنانی ئەلفبای پیتی لاتینیدا (فەرات جەوەری) لەم بارەیەوە دەڵێت: «قەدری جانی بازدایی ژی گهیشتبو جەلادەت بەگ و دگۆڤارا وی دە یەک ژ نڤیسکارێن بەردەوام بوو» [(٣)]. گۆڤاری هاواریش ئاماژە بەم چەندە دەکات، و دەڵێت:

شەهلەوەندی سواری
خۆرتێ منی ل کاری

٢- جەلادەت بەدرخان، ئارمانج، ئاوایێ خەبات و نڤیساندنا هاوارێ، گ: هاوار، ژ: ١، شام، ١٩٣٢، ل١ . (لاتینی)
٣- فەرات جەوەری، کولتوور هونەرو ئەدەبیات، نوودەم، ستۆکهۆلم، ١٩٩٦، ل١٠٣ (لاتینی).

هەرچەند دووری و چووی
نووخوریێ من لێ تویی(٤)

ئەم بلیمەتە هەموو تواناى خۆی خستۆتە گەڕ بۆ ئەوەی ئەم گۆڤارە زیاتر بەرەو پێشەوە بچێت. هەروەها شارەزاییانە خۆی خستۆتە قوولایی دەریای ئەدەبیاتی کوردی بۆ ئەوەی مەلەوانییەکەی بیگەیەنێتە ئاستێکی زۆر بەرز کەبتوانێت هەموو شەپۆلەکانی ئەم دەریایە بەرفراوانە ببڕێت و لە هەموو لایەنەکانی شارەزایی پەیدابکات، بۆیە ئەگەر لە گۆڤاری «هاوار» رامێنین دەبینین شاعیر زۆربەی هەرە زۆری بەرهەمەکانی لەم گۆڤارەدا بڵاوکردۆتەوە، کە لە کۆی «٥٧» ژمارەدا لە «٢٢» ژمارە بەشداری کردووە، تەنانەت هەندێ جار لەیەک ژمارەدا دوو یان سێ بابەتی بەبەرچاو دەکەون، ئەمەش لێهاتووی و بلیمەتی ئەم کەڵە شاعیرەمان بۆ دەردەخات، بۆیە گۆڤاری «هاوار»یش لەبەرلێهاتوویی ئەو وەک کوڕی خۆی داناوە، جگە لەمەش بە تازەگەرو نوێ خوری ناوی دەبات. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو پارچە شیعرەیە کە بە ناوی «جوهابا دایکێ»(*) پێشکەشی شاعیر کراوەو بە جوانترین پەیڤی کوردی هۆنراوەتەوە، کە تێیدا ستایشی شاعیر و بابەتە بەپێزەکانی دەکات. ئەمەی خوارەوەش چەند کۆپلەیەکی هەڵبەستەکەیە:

٤- هاوار، جوهابا دایکێ، گ: هاوار، ژ: ١٨، شام، ١٩٣٣، ل٣ . (لاتینی)
* ئەم شیعرە بەناوی (هاوار) بڵاوبۆتەوە، بەڵام هی جەلادەت بەدرخانە، جگە لەمەش ئەم پارچە شیعرە لە دیوانەکەی (وەرە دۆتمام)دا بەرچاو دەکەوێت.

قەدری، قەدری جانێ من
کورکێ من، چاڤێ من
نڤیسارا تە گها
خوەش مقام و پڕ بها
هەرێ زیزە ب کولە
خوەش بهنە ئەو سۆرگولە
هەم دەنگە، هەم لاژەیە
خۆش کەلامە، بێژەیە
تاکو دەگاتە:
کوردمانجیەکە خوە روویە
شوکرێ مەکە گەزۆیە
ب خاترێ تە کوڕێ من
ب تە ڤە یە دلێ من[٥]

کاتێ قەدری جان چاوی بەم هەڵبەستەدەکەوێت، خۆی پێ ڕاناگیرێت و دەست دەداتە خامەکەی و بە هەڵبەستێکی ڕێک و پێک بە ناوی (جوهابا لاوانی ل دییا هاوارێ) وەڵامی دایکی (هاوار) دەداتەوەو دەڵێت:

دادێ! دادێ، هاوارێ
ڕۆما، نان ژ بەر خوارێ
گەلەکی ئەز کێفخوەش بووم

٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣ .

ژ بەر تە پرسیارێ
ڤێگاڤ حالێ من قەنجە
ئەڤ ئەرد ژ من رە گەنجە
تاکو دەگاتە:
ئەز بێمە سەر فکرا خوە،
گۆتن و ئارمانجا خوە
بهنامن پڕ فرەهـ بوو
ب گۆتنێن دییا خوە(٦)

هەڵبەتە خۆشەویستییەکی بێ پایان لەنێوان گۆڤاری هاوار و شاعیر هەبووە، لەبەر ئەوە ناتوانین گۆڤاری هاوارو شاعیر لەیەکتر جیابکەینەوە، کاتێ دەڵێن هاوار واتە؛ قەدری جان پێچەوانەکەشی هەر راستە.

٦- قەدری جان، جوهابا لاوانی ل دییا هاوارێ، گ: هاوار، ژ: ٢٠، شام ١٩٣٣، ل١١ .(لاتینی)

## بیری نەتەوایەتی لای شاعیر

لەبارەی هەستی نەتەوایەتی لای شاعیر دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوول دەڵێت: «من و قەدری جان لەبەغدا بووین، کە بەسەفەر هاتبوو، بۆ بەغدا پیاسەیێکمان کرد بۆ سەر پردی (الاحرار)، هەروەها (پردی شەهیدانیشی پێ دەڵێن. ئا.ع)، کە دەکەوێتە سەر رووباری دیجلە، لەکاتێکا وەستابووین لەسەر پردەکە تەماشای ئاوەکەمان دەکرد، لەدوانێکدا قەدری جان گوتی: (کاک عیزەدین دەزانی ئەم رووبارە، رووباری کوردانە) منیش گوتم: چۆن ئەمە رووباری کوردانە، لە وەڵامدا گوتی: (ئەم رووبارە سەرچاوەکەی لە گوندی ئێمە کە ناوی (دێرک)ە هەڵدەقوولێت، واتە کوردستانی باکوور کە لەهەرەتی منداڵیدا زۆر جار چوومەتە سەر سەرچاوەکەی)».(١)

لەبەر رۆشنایی ئەم دەربڕینەدا، ئەگەر چاوێک بەبەرهەمەکانیدا بخشێنین، جا چ بە شیعرەکانی یاخود چیرۆکەکانی یان هەر نووسینێکی، هەستی نەتەوایەتی لەو بابەتانە رەنگدەداتەوە، کە لەلای شاعیر لایەنێکی هەرە دیاری ژیانی بووە، کارێکی ئەوتۆی لەسەر بەرهەمە شیعرەکانی کردووە، کە شوێنێکی تایبەتییان لەم بوارەداو لە مێژووی ئەدەبی میللەتەکەماندا گرتووە، بۆ ئەم

١- ئەم گوتەیەم لەبرای بەرێز: «م. بەکر شاکر کاروانی» وەرگرتووە، هەروەها مامۆستا (عبدالصمد دۆسکی)ش ئەم دەربڕینەی بۆ من گێڕایەوە. کە گوتی لە کاتی قوتابی بووین لە قۆناغی بەکالۆریۆس لە زانکۆ د. عیزەدین مستەفا رەسووڵ بۆ ئێمەی گێڕایەوە.

مەبەستەش لێرەدا، هەوڵی ئەوە دەدەین کە لەم لایەنەوە دەست نیشانی هەندێ هەندێ لەو بۆچونانەی ناو بەرهەمەکانی بکەین.

شاعیر لە شیعرێکی دا بەناوی (دادێ)، جوانترین وێنەی کوردستانی لەناو خۆشەویستی دایک دا دەربڕیوەو کوردستانی بەدایکی خۆی چواندووە، چونکە بە سۆزترین خۆشەویستترین شتە لای شاعیر هەروەک دایکی. بێگومان زۆر لە شاعیرانی کورد، کوردستانیان بە دایک یان بەیار چواندووە، چونکە خۆشەویستی مرۆڤ بۆ ئەو دوانە، واتە کوردستان و دایک لەهەموو شتێک زیاترە، هەروەک جگەرخوێن لە شیعرێکیدا دەڵێت:

ژ بونا هەر کەسەک یارەک هەیە ئێ من وەلات یارە
بەلێ چ بکەم، د دەستێ دژمنێ خوین خوارو غەدارە
پەسنێ گران بێژم  نکارم ئەز بدم زانین
چەلەنگ و نازک و شەنگ و شەپال و شۆخ و جەبارە[٢]

هێمن موکریانیش لەم بارەیەوە شیعرێکی گوتووە بەناوی: (دایکی نیشتمان) کە تیایدا، کوردستانی نیشتمانی کورد بە دایکێکی ڕەشپۆش ناودەبات هەروەک دەڵێت:

لەکاتی نیوەشەودا بوو شەوێ دی
ژنێکی پیرو ڕەشپۆشم لەخەودی

٢- سەبری بۆتانی، جگەرخوین ل عێراقێ، گ: نووسەری کورد، ژ: ٦، ١٩٨٨، ل١٧١ .

به پارێز چوومە پێش لێی و گوتم پێی
چکارەی دایە پیرە، پێم بڵێ کێی؟
لەبەرچی وا دژو داماوی دایە
چ قەوماوە کەوا شێواوی دایە؟
چیە؟ چۆنە لەبەر تۆدا جلی ڕەش؟
سەرو شان و ملت بۆ ناوەتە هەش؟
گوتی نازانی رۆڵەی هیچ نەزانم
ئەمن کێم؟ رۆڵە دایکی نیشتمانم[٣]

شاعیریش کوردستانی بە (دایک)ی خۆی داناوە، کە تیایدا بەهاری ژیانەکەی بە پاییز ناو دەبات، ئەمەش لە ئەنجامی ژێر دەستەیی وڵاتەکەیەتی، کە پێی وایە: هەمیشە لەبەر ئەم دەردەدا جەرگی سووتاوەو هەناسەی لێبڕاوەو لە شیعرەکەیدا، درێژە بەم دەربڕینانە دەدات و دەڵێت: چونکە ژێر دەستین، ئێمەش هەمیشە پەرێشان و مەستین، ئاوەز لەسەر زماندا نەماوە، هیچ خواردن وخواردنەوەیەکمان نییەو بەردەوام فرمێسکی خوێن لە چاومانا دەبارێت، بۆیە هیواداریین کە دایە نەناڵێ:

بوهارا ژینا من بێ تە پایزە دادێ،
بۆ من دیارێ جەنەت بێ تە فازە دادێ.
چێلکەوا لنگ شکەستی ل پێ هەڤالێن خوە ما،
چێلکەوا ئەز بم و نەگریم ماقەی جایزە دادێ!

٣- هێمن موکریانی، تاریک و روون، چ، بنکەی پێشەوا، ل٨٤ .

***

ژ بەرکێمانییێن خوە، ل جەم تە شەرمزارن،
تەنێ تو کوور مەنالە، ئەم ژ تە هێڤیدارن،
ژ چاڤێن مەیێن مەلوول هێسترێن خوین دبارن،
ژانا زراڤ تۆڤ مەکە، ئەمان! پاکیزە دادێ!(٤)

لە ناوەڕۆکی چیرۆکە شیعرێکی شاعیر دا کە بە ناوی (هەسنکەر) هاتووە، ئاسنگەرێک کەوتبووە ململانێ لەگەڵ ئاسنی ئەستوور و بریسکەدار، شەوی دەنایە سەر رۆژ و رۆژیشی دەگەیاندە شەو، بێ وچان و بەدڵی پڕ ئاخ و گیانی پڕ لە قوربانی دەستی نەدەگێڕایەوە لە کوتاندنی ئاسنەکەو خەباتی نەمرانەی لەگەڵدا دەکرد، لێرەدا شاعیر جۆرە لێکچوونێکی سەلیقانەی دەربڕیوەو دوژمنی سەرسەختی گەلی کوردی بەم ئاسنە چواندووە، کوردیش بەو دەست و بازوو ماندووەی کە وەستا کە چەکوشی پێ دەوەشاند و ئارەقەی لێ دەڕشت. لەسەرەتادا شاعیر جۆرە رەش بینییەک نیشان دەدات کەدەبینین زنجیرەکە ناپسێت و لەناو ناچێت، بەڵام بەگفتوگۆکرن لەگەڵ ئاسنگەرەکەدا، پێی رادەگەیەنێت، کەچارە بۆ شکاندنی ئەم زنجیرەیە، واتە (دوژمنانی کورد) تەنیا یەکێتی و هاوکارییە، خوای گەورەش یارمەتی دەرمانە بۆ رزگار بوونمان لەم بارەیەوە وەکدەڵێت:

هەسنکەرەک شەڤ و رۆژ، دخەبتی ژ دل و جان

٤- قەدری جان، دادێ، گ: هاوار، ژ: ١٤، شام، ١٩٣٢، ل٣. (لاتینی)

خەباتا وی زنجیرەک، کو ناقەتە تو جاران
هەر جارەکێ کو چاکووچ، لێدخست دلخوەش دبوو
ئومێدا وی قەویتر، هێڤییاوی گەش دبوو
ب وی چاکووچێ بچووک، ئەو زنجیرا قەراسە ،
ما تو جار تێ شکاندن، گەلۆ کی پێ هەساسە. (٥)

(دشۆرەزارەکی)دا کە یەکێکە لەشیعرە نایابەکانی شاعیر، لە ناوەکەیەوە را دیارە کە وشەیەکی فارسییەو بە مانای زەوییەکی بێ پیت و بەرهەم و وشک دێت، شاعیر لەم شیعرەدا زۆر رەشبین دیارەو وەسفی شاعیرێکی تراژیدی بۆ خۆی دەکات و دەڵێت:

سۆل د لنگێ مە نەما ، پرتینە جلێ مە
نەینووکێ مە درێژن، بوونە گولی پۆرێ مە. (٦)

ئینجا پێدادێت و وەسفی ژیانی خۆی و کوردان دەکات وتێیدا لەگەڵ کەسێکی تری کورد دەدوێت و ئەو ئاخ و ئۆف و خەم و پەژارەیەی، کە هەیەتی تێیدا دەدەبڕێت و دەڵێت:

من ژێ رە گوت:
- ئەی برا تە چ حال و هەواله؟
چمان وسان ل ئەردێ ڤەکەتی دناله؟
وی ژی ل من ڤەگەراند، گوت:

٥- قەدری جان، هەسنکەر، گ: هاوار، ژ: ٧، شام، ١٩٣٢، ل٩. (لاتینی)
٦- قەدری جان، دشۆرەزارەکێ دە، گ: هاوار، ژ: ١٠، شام، ١٩٣٢، ل٤. (لاتینی)

– دەردێ من گرانە، ؟
چیرۆکا من درێژە، بێت نڤیسین رۆمانە
ئەز ژ کوردێن سەرحەدێ؛ مەلازگردە گوندێ من
ئەز دەرکەتی هەفت سالە. ب هش و ب دلێ من(٧)

قەدری جان هەستێکی نەتەوایەتی یەکجار بەرزی هەبووە، بە هیچ جۆرێک دانی بە چوارپارچەیی کوردستان دانەدەناوە، هەموو کوردستانی بەیەک پارچەو یەک ولات زانیوە، بەیەک چاو سەیری کردووە، کەچی بەداخەوە، تائیمرۆش کە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمداین هێشتا هەندێ لە شاعیرانمان خۆیان بەپارچەیەکی کوردستان... یاخود گروپ و دەستە و لایەنێکەوە بەستۆتەوە کە دوورە لە هەڵوێستی کوردایەتی و نەتەوایەتی، بەڵکو پێویست بوو هەمیشە لەسەر رێبازی کەسانی وەکو (قەدری جان) بوونایە، دەنگیان لەگەڵ دەنگی ئەو بوایە وەک دەڵێت:

ئازاد بوویە سلێمانی
سبە دۆرا مووش و وانی
مەهاباد و سنەو بانی!
رۆژا کوردستانێ هەلات..(٨)

شاعیر زۆر بە راشکاوی ناوی ئینگلیز (کە مەبەستی بەریتانیایە)، ئەمریکاو عەجەم و تورانی دێنێت، بە خراپە باسیان

٧- هەمان سەرچاوە: ل٥ .
٨- قەدری جان، شێرێ وەلات.. بارزانی هات، گ: هیوا، ژ: ٤، ١٩٥٨، بەغداد، ل٧٧ .

دەکات و کاری دڕندانەیان دەخاتە بەرچاو، روون و ئاشکرایە کە لەسەرەتای سەدەی بیستەم بەریتانیا گەورەترین رۆڵی گرتۆتە دەست لە پارچە پارچەکردنی کوردستان، عەجەمیش مەبەستی حکومەتی شاهەنشاهی ئێرانە، کە سەدان ساڵە کورد دەچەوسێنێتەوە، تۆرانیش مەبەستی تورکە رەگەز پەرستەکانە کە تا ئەمڕۆش لەسەری بەردەوامن شاعیر زۆر بە راشکاوی گفتوگۆی ئەوان و خەڵکانی ترو کورد خۆیشی دەکاو دەڵێت: راستە ئەوان تۆپ و تانک و باشترین چەکیان هەیە، بۆ ئەوەی میللەتی کورد بکوژن یاخود بەباڵەفڕەکانیان زارۆکەکانی کورد قڕان بکەن، وەک زۆرجار کردوویانە، بەڵام ئەوان هەرچەند کوردان بکوژن، کورد هەر دەمێنن و لە ناو ناچن، یان هەتا مێرو ژن هەبن، کوردایەتی هەر دەمێنێ، دوا ئەنجام هەر رۆژێکمان بۆ هەڵدێت کە بەئامانجی خۆمان بگەین، وەک دەڵێت:

بشارێ خوە کرنە ئینگلیز، ئەمریکان،
ئەسرارکێشێن عەجەمان وتۆرانی یێن (تورکان)
ئەو دکارن مە بکوژن.
تۆپ و تانگێ وان هەنە
زارو زیچان قڕ بکەن...
بالافڕێن وان هەنە...
لێ بەرا بزانن
کو چقاس کوردان بکوژن
کوردێتی ئەوێ بژی
گەر بمینە مێرو ژن

بێگومان رۆژا مە ژی
ئەوێ بێ رۆژا راستی[(٩)]

شاعیر بەشێوەیەکی زیرەکانە و هونەریانە ئەوە روون دەکاتەوە، کەبستە خاکێکی کوردستان نییە خوێنی کوردی تیا نەڕژابێ، هەموو شوێنێک گۆڕی شەهیدانە، کە خوێنی ئالیان ئەو ناوەی پڕ کردووە، لە ئەنجامی ئەم خوێنە زۆرەش دارو بەردو شاخ و زناریش دەگرییێن بۆیە ئەویش بێ وادە هاوار دەکات:

ل عەردێ دنێرم، دلۆپێن خوینێ
ددمەسەر شوپێ چ ببینم ئەز
داروبەر، کەڤر وکوچ گش دکن شینێ
بێ حەمدی جانێ خوە دقیرینم ئەز.[(١٠)]

شاعیر چاوی بەزوڵم و زۆرداری دوژمنانی کوردستان کەوتووە، کە چۆن رەش بکوژانە تەڕو وشک بەیەکەوە دەسووتێنن و منداڵان هەتیو دەکەن، ئافرەتان بێ پیاو دەکەن، لاوانی کورد لە خوێن دەگەوزێنن و جەرگی دایکەکانیان دەسوتێنن، بۆیە بە دەنگێکی بەرز بانگی وڵات دەکات و داوا لە کوردان و برایەکانی دەکات کە دەست بدەنە چەک و لەماڵ دەرچن، چونکە رۆژ رۆژی خەباتە، ئەی ئەگەر

٩- قەدری جان، شینا پێشەوایێ مەزن قازی محەمەد، وەرگێڕ ژ پیتێن لاتینی، ئەندازیار عەزیز بۆتانی، ر: العراق، ژ: ٢٨٢٠، ١٩٨٥ .
١٠- قەدری جان، تابووتا بخوین، گ: هاوار، ژ: ١١، شام، ١٩٣٢، ل٦.
(لاتینی)

ئیمرۆ بەرگری لەماف و وەلاتە داگیرکراوەکەیان نەکەن کەی بۆیە دەڵێت:

ئاخ وەلاتۆ ئاخ وەلاتۆ
رۆژا مە زوو لێ هەلاتۆ
باڤ و برێن مە چاوانن
چما خەبەر ژێ نەهاتۆ
تاکو دەگاتە.....
برایێن مە تێنە کوشتن
ب خوینێن خوە تێنە شوشتن
خوەهان پۆرێ خوە شاندنە
یانی «چماهوون رونشتن». (۱۱)

شاعیر بیرێکی فراوانی هەبووە، دەیەوێت خۆی لەو بیروباوەڕانە بەدوور بخات کەکۆن و کۆمەڵگا بەسەریدا زاڵ کردوون، چونکە پێی وابووە دەبێ مرۆڤ بەپێی سەردەم بڕوا بەڕێوە، بەڵێ هەموو کات و سات لە نیشتمانپەروەرییەوە دەست پێدەکات تاوەکو هەموو ئەو پەردانەی کەرەش بوون لای بدات و خۆی لێ رزگاربکات:

ئەو پەردەیا رەش و تاری،
کو ژ شەڤێن رەش دیاری،
من...
ژ روویێ خوە کشاند

۱۱- قەدری جان، خەونا هشیاریێ، گ: هاوار، ژ: ۱۳، شام، ۱۹۳۲، ل۲. (لاتینی)

ل بەر چاڤێ خوە چراند...
ئو ئاڤێت... ...
ئاڤێت پاش سەد چیایی...
ناڤا هەزار دەریایی...
من گەمارا گوهێ خوە،
ب زەمزەمەکە نوهـ شوشت؛
ئو میکرۆبێن جانێ خوە
ب دەرمانەکی نوهـ کوشت(١٢)

لە شیعرێکی تری دا بەناوی (کاروانێ مە) باس لەبەردەوامی کاروانی خەبات دەکات، ئەو کاروانەی کە، ماوەیەکی درێژە رێگایەکی دووردەبڕێت، رێگایەکی پڕ کۆسپ و تەگەرە دژوار بەرەو ئامانجێک کەئەویش رزگاربوون و گەیشتنە بە ئاسۆیەکی گەش، گەیشتن بەم ئاسۆیەش نزیک بووە، چونکە ئێمە بەسەرگەلێ قۆناغدا تێ پەڕیوین، دەریایەکمان خوێن رشتووە، چیا بە چڕو پڕو دارستانەکان و دەشتە پڕ لە دڕک و دالّەکان و دۆڵ و گەلییە تەنگ و تاریکەکانمان بڕیون:

ئەم هیچ نەوەستیاین و ناوەستین
ل سەرڤێ رییا دوور
سەرڤێ رییا دژوار
ئەم دچن... و ئەمێ بچن.

١٢- قەدری جان، رەیاتازە، گ: روناهی، ژ: ٢٦، شام، ١٩٤٢، ل١٧.
(لاتینی)

بەر ب ئارمانجا خوە...

***

سەردەریایی بخوین
ژ چیاییێن دار و دەڤی
دەشتێن بکەلەم و هستری
نەوالێن تەنگ وتاری
ئەم دەربازبووین(١٣)

ئەگەر ئێمە لەو شیعرەی کە بەناوی (نامەیەک بۆ ئێستگەهێ رادیۆ تاران) دایرشتووە، رابمێنین، هەستێکی زۆر قووڵ و زانستیانەمان بۆ روون دەبێتەوە کە بە بێژەرەکە دەڵێت: (برادەری کورد زمان) پێی ناڵێت برادەری کورد، لێرەدا شاعیر ویستوویەتی پێی بلێ کە تەنیا زمان مەرج نییە بۆ بەکورد بوون، بەڵکو شان بەشانی زمان مەرجی تریش هەن یاخود بە مانایەکی تر ویستوویەتی پێی بڵێت: تۆ تەنیا زمانت کوردییە دەنا کورد نی! هەروەها دەڵێت ئەمە دەنگی دیلەکانە... دەنگی ئەوانەیە کە دەستیان لەزنجیرو قەیددایە، ئەگەر تۆ راست دەکەی بۆ (وان) و(بتلیس) بگری بۆ هەموو پارچەکانی کوردستان بگری وەک دەڵێت:

ئەی تەرجمانێ شاهنشاه
بگری بۆ وان و بتلیس

١٣- قەدری جان، کاروانی مە، گ: روناهی، ژ: ١، بەغداد، ١٩٦٠، ل٥١.

مەگری بۆ شەیتان و ئیبلیس
زنهار...
ئێستگەهێ رادیۆ تاران
برادەرێ کورد زمان
دەنگێ دیل و ئەسیر
دەستێ بقەیدو زنجیر(١٤)

یەکێ لە خەسڵەتەکانی سروشتی زۆربەی خەڵک ئەوەیە کەبێ هیواناین یان بێ هیوا بوون کاتییە، ئەمەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، بەڵام لەم شیعرەدا، دەبینین شاعیر زۆر گەشبینەو هیواو ئومێدێکی زۆری بەدوا رۆژ هەیە، بۆیە ئەم هیواو ئومێدەی بەشیعر دەربڕیوە، رووی کردۆتە میللەتەکەی و پێیان دەڵێت: ئێمە هەر بە ئەمانجمان دەگەین جا چ زوو یا خود درەنگ، بۆیە نابێت خۆمان بێ ئومێد بکەین، بەڵکو دەبێت چاوشارکێ لەگەڵ داهاتوویەکی گەشدا بکەین:

ئەڤ خەبات و جەهدا من گۆتنا باڤا نی یە
گەر ئیرۆ نەچە سەری، بۆ سبێ هێسا نی یە.
بێ ئومێدی نەقەنجە، تودەستێ خوە ڤەماڵە
نەئەز زێدە خوەھ بدم، نەتو بۆ من بناڵە
یەکدەست ئەم ب رەپێن کن، هەڤال دبە زلجەلال
برا تۆڤا دیلییێ، ببە پۆلایێ زەلال(١٥)

١٤- قەدری جان، نامەیەک بۆ ئێستگەهێ رادیۆ تاران، ر: ئازادی، ژ: ٤٦، کەرکووک ١٩٥٩ .
١٥- قەدری جان، هەسنکەر، گ: هاوار، ژ: ٧، شام، ١٩٣٢، ل٤.(لاتینی)

هەندێک شیعری دڵداری لە گۆڤاری «گەلاوێژ» لەساڵانی چلەکاندا بڵاو کرابوونەوە، ئەوکاتیش رووداوی گۆڕەپانی (چوارچرا) رووی دابوو کە پێشەوا قازی محەمەد لەلایەن داگیرکەرانی کورد لە سێدارە درابوو، کاتێ قەدری جان چاوی بەو شیعرانە دەکەوێت کەهی (نالی) و (کچاکورد) و (پیرەمێرد) بوون، زۆری پێ ناخۆش دەبێ، وەک رەخنەگرێک شیعرێکیان بۆ دەهۆنێتەوە بە ناوی (وەختی نیە) و پێیان دەڵێت: نیشتمان بریندارە وەختی دڵدارو ئەڤینی نییە، کوردستان رەشپۆشە، شین و گریان هەموولایەکی وڵاتی داگرتووە، بەقووڵیی گریانەوە داوایان لێ دەکات، ئەمە رۆژی دڵداری و مەستانە نییە بەڵکو رۆژی خەباتە، بەرخودانە ئەبێ خەبات بکەین تاوەکو گەلی کورد لەو مەینەتیانە رزگار بن و هەناسەی ئازادی هەڵمژن وەک دەڵێت:

نیشتمان بریندارە، وەختی ئەفسانە نیە.
لەبەر چاوان سەدارە، وەختی بێگانە نیە
ئەی جەنابی «پیرەمێرد» ، ساڵ دیدەی گەرم و سەرد
بۆچی تو پڕ ئەکەی دەرد؟
وەختی «مەیخانە» نیە[١٦]

شاعیر بەهۆی شیعرو کارە هونەرییەکانی و هەروەها لە نیشاندانی تێکۆشانی گەلەکەیدا جێگایەکی گرنگی لەمەیدانی

١٦- قەدری جان، وەختی نیە، گ: گەلاوێژ، ژ: ٩-١٠ بەغداد، ١٩٤٧، ل٣٥-٣٦

خەباتی نیشتماندا گرتووە، بەشێوەیەک کەهەموو بەهرەکانی خۆی خستۆتەگەڕ بۆ بەرگری کردن لەبەرژەوەندییە باڵاکانی، بۆیە لە شیعرێکی دا تیشک دەخاتە سەر تایبەتمەندێتی و رۆڵی مرۆڤ لەم جیهانەداو بایەخ و چاکەکانی زانست و زانین لەجیاتی بەدەست هێنانی دەوڵەمەندی ماددی، وەک دەڵێت:

مەزناتی
نە ب پارە و مالە
نە ب گۆڕینا کالە
مەزناتی
ب جەوهەرێ ئینسانە
ب عیلم و عیرفانە
بەلێ... ئەم خەزانی مالن
لێ زەنگینێ کەمالن
زەنگینێ ئیدیالن(١٧)

پاشان تیشک دەخاتە سەرکێشەکانی ململانێی چینایەتی و چەوساندنەوەی گەلە ژێر دەستەکان، هەروەها بە روونی ئەوڕەفتارە ناشیرنانە لێکدەداتەوە، کە چینەکانی نێو کۆمەڵگا پەیڕەوی دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا داواکانی شکست و ملکەچ کردن بۆ گیانی بێ ئومێدی رەت دەکاتەوەو پەنا دەباتە بەر سۆزو هیواو ئومێدەکان، کە بە بۆچوونەکانی خۆی پێویستە گەلانی تێکۆشەر لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان، هەڵگری ئەم سیفەتانەبن:

١٧- قەدری جان، بەگێ ئاخر زەمان، روناهی، ژ:٥-٦، بەغداد، ١٩٦١، ل٥٣ .

کوشکا تەیە هیم ڤالا
یا ب نینۆکا پالا
ئین ب خوین
ئین برین
گەلەک رەبەن برچینا کوشت
تە ئاڤاکر دبندا روونشت
ئەویَ لەسەرسەریَ تە هەلوەشە
گەرچی دلیَ مە بە تە نائێشە[١٨]

هەرەتی لاوێتی بۆ تاک و کۆی سەرجەم کۆمەڵان جێگای هیواو ئومێدە و تەمەن لەم قۆناغەدا، گەشانەوەی بەهارێکی ساوایە، تیایدا هاورێیەتی راست و دڵسۆزانە بەدی دەکرێت، مرۆڤ بەرەو لوتکەی کۆشش و قوربانیدان لە رێگای مرۆڤایەتیدا دەبات، بە تایبەتیش هاورێیەتی لەسەر بنەمای تێکۆشان لە پێناو رزگارکردنی گەلانی هەژارو ژێر دەست، کاتێک هەڤاڵێکی قەدری جان تاڵیی مەرگ دەنۆشێت- کە هەموو زیندەوەرو بوونەوەرێکی سەر ئەم زەمینە بە یەکسانی ئەم تاڵییە دەنۆشن شاعیر زۆر دڵتەنگ و غەمبار دەبێت و لەگەڵ لاشەیەکی ساردوسر دەکەوێتە گفتوگۆو لە ئاستیدا دەڵێت: داخورپانی دڵی ئێمە بەئاگری خۆشەویستی تۆ سەرچاوەی جۆگەو جوباینی فرمێسکە زولاڵەکانی ئێمەیە. لەگەڵ سڵاومان بۆ گۆڕەکەت، بۆ ئەو چیایانەی بوونەتە کێلی بانە سەرت،

١٨- هەمان سەرچاوە: ل٥٣ .

کە ئێستا دیارنییە، بۆیە لە دوورە ولاتەوە سلاوی خۆی بۆگشت دارو بەردو کوچەو کۆلان و گوندو شارەکانی ولات دەنێرێت و دەلێت:

ژ بۆ گیانێ تە چقاس شین و گری بت هێژایە،
موخابنا جوانیێ، بەژن زراڤ، خورتێ دەلال.
وەفاکارێ هەڤالێن خوە، وەلات- پارێز ب راستی،
ددنێ دە من هێژا نەدیت، ژ تە چێتر، قەنجتر هەڤال.
سەلاڤێ من ژ دوور ل گۆرنیاتە و چایێ جوودی
ئۆ ژ زەمزەم پرەستەشتر چەمێ دیجلێ ئاڤا زەلال.[١٩]

سووتانی هەناو، بارینی فرمێسکی چاوان لەسەر یەکگرتنی هاورێیەتی دەبێتە مایەی خۆ لە یەکتردا دیتنەوە کاتێک تۆ لەژێر خاکا مردوی ئێمەش هەر هاورێتین و لەسەر خاکەوە مردووی زیندووین و تەنها نالەو گریانمان لەدەست دێت:

هەگەر تو حەسرەت کێشێ باڤ و برانی دین ئاخێ،
ئەز ژی ل سەر دنێ تەنها مامە، ژ دل تێن نالەنال...[٢٠]

ژینگە و بۆماوە دوو کاریگەری گەورەن لەسەر هەر مرۆڤێک نەخاسمە ژینگەی کوردستان کە لە ئاووهەوایەکی دلرفێن و دیمەنێکی سەرنج راکێش پێک دێت، هەر ئەم پێکهاتە و چەندین

١٩- قەدری جان، شین، ر: رۆژانوو؛ ژ: ١٨، بیروت ١٩٤٣، ل٤ . (لاتینی)
٢٠- هەمان سەرچاوە: ل٤

دیمەنی دیکە مرۆڤ بەرەو سەر سوڕمانی دەبەن، کە ئەمانە کاریگەرییەکی گەورەیان بەسەر شاعیرەوە هەبووە. ژێر دەستی خاکی وڵات و نەزانین و دەربەدەری میللەتی کورد دوو هێلی تەریب بوون لە ناو هزرو بیری شاعیردا کە هەموو کاتێ پێوەی ناڵاندوە. پێچەوانە بوونەوەی وڵاتێکی بە هەشت ئاسا لە دۆزەخ، سووتان وبرژاندنی دڵ و ناخەکانە، بە تایبەتیش بۆ مرۆڤێکی ژیرو هەست ناسک کە نەگەیشتن بە بەهەشت و لێرامانی ئەو دیتنی چاوان و سووتانی ناخ بووە، بۆیە شاعیر دەڵێت:

پەرچاکە ژ بهوشتێ
بەسرەکا زێرین وەلات
ئیرۆ دەست ناگەهشتێ
ئاخ و کەسەر ژ دل هات(٢١)

تاڵان و وێران وخاپوور بوونی وڵات هیچ کاتێ لەبەر چاوی شاعیر لانەدەچوو، دووبارە بوونەوەی ئەم دیمەنە تاڵ و ناشیرینانە هەردەم لەبەرچاوی بوون، بۆیە بەچاو دەیبینێ و بەدەم دەڵێت:

کولێبە بوویە خۆپان
دەنگێ بەرێ ژێ نایێ
تەماشاگاها خۆرتان
ژ من ژی سێوی مایێ(٢٢)

٢١- نەوزاد، دێرک، گ: هاوار، ژ: ٢٤، شام، ١٩٣٤، ل٧ .(لاتینی)
٢٢- هەمان سەرچاوە: ل٧ .

ئەم تالآن و خاپووركردنە شاعیر بەرەو دڵتەنگی و نائومێدی دەبات و دەكەوێتە نێو حەسرەتی هیوا خوازی، بۆیە ئەگەر ئازادی و خۆشەویستی وڵات و هەست و سۆزی نەتەوەیی بەرەو مەرگیشی ببەن، ئەوا هەر بەو ئومێدەیەو چاوەڕوانی ئەوەیە جارێكیان چاوە زڵ وئاوەژوو بووەكانی بچنە خەوێكی قووڵەوە، بەڵكو لە خەودا جارێكی تر بكەوێتەوە بەهەشتی ئازادی و رزگاری وڵات، هەروەكو دەڵێت:

خوەزی ڤێ جارێ ژی من
سەرێ خابێ بدیتا
بلا روهستێن جانێ من
هنگێ ژ خوە ر بمێتا (٢٣)

خۆدیتنەوە لەناو دوو ئاگری گەورەو دوو خۆشەویستیدا وڵات و شۆخێكی دەلال، جارێک وڵاتی دەكردە شۆخ جارێكیش شۆخەكەی خۆی بەوڵات دەزانێ، لە نێوان ئەم هەموو ئێش و ئازارەی خۆشەویستی وەكو گەڕۆكێكی خاوەن خەم و كەسەر بەدوای خۆشەویستی خۆیدا دەگەڕێت، لە رێگای رێبوارانی ژیاندا جەرگ و دڵی دەسووتێ و فرمێسک لەچاوانی دێ و گلەیی و گازاندە لەچەرخی فەلەک دەكات و دەڵێت:

دلێ من ب كول چاڤ ژی ب هێستر
دەرد ژ دەرد زێدە غەم ژ غەم بێتر

٢٣- هەمان سەرچاوە: ل٧ .

فەلەکێ ڤاژی چەرخا خوە گەراند
لەیلاو مەجنوون ژ نک هەڤ قەتاند[٢٤]

گەڕانەوەیەک بۆ رەگ و ریشەی ئەو بیرانەی گرێدراون بە خاکی ولاتەوە، شاعیر بێ هۆش دەکات و هەموو ئەندامانی جەستەی ئاواز دەڵێن و دڵ دەسووتێن و فرمێسک دەبارێن و زمان، گفتوگۆ لەگەڵ دارو بەردو دەشت و دەری ولاتدا دەکات، بە رووی کێوەکان دەڵێت: کاروانەکەم بپەرێنەوە من بەدوای عەشقی خۆمدا وێڵم، یارمەتی لە ئێوە دەخوازم ئەوەی دەمم دەیڵێ دڵم نایڵێت:

ئەز دچم رهێ من ژی ما با وە
گەر من گۆت «بەس» ب دلێ خاڤە.
ژ لەورا من گۆت، مە بن قەت رازی
حەقیقی نینە. بەلکی مەجازی..[٢٥]

نەگەیشتنی خۆشەویستی گەورە و ژیان لەگەڵ هزرو بیرکردنەوە گەڕانەوەیەکی دەست بەتاڵ و هیوا شکێنە و دڵ سووتانە.

ژ لەورا ب چاڤ دیتن نە مابوو
دلێ من تەنێ ژێر هێلین مابوو.[٢٦]

٢٤- نەوزاد، دەست ژێ بوو، گ: هاوار، ژ: ١٦، شـــام، ١٩٣٣، ل٤ . (لاتینی)
٢٥- هەمان سەرچاوە، ل٤ .
٢٦- هەمان سەرچاوە، ل٤ .

## ئاشتی و برایەتی لای شاعیر

ئاشــتی و برایەتی دوو بەهای بەرزن، کـە مـرۆڤـایەتی هەر لە کـۆنەوە هەوڵی بەدەست هێنان و سـەقـامگیـرکـردنی داون، بەڵام بەداخەوە هەمیشە کەسانێک هەبوونە، نەیان هێشتووە خەڵک بە ئاشتی وەک برا لەگەڵ یەکتر بژین، ئاشتی هەمیشە هیوای گەلی کورد بووە، کە بەداخەوە کەم جار هەبووە، بۆماوەیەکی کورتیش بێت بەتایبەتی لەسەدەی بیستەمدا کورد لەژێر سێبەرو چەتری ئاشتی دا ژیابێت، بۆیە دەبینین ئاشـتی و برایەتی لە نێـو شیـعری تێکڕای شاعیرانی کورد دا، پانتایەکی زۆری داگیر کردووە، کە شاعیرانمان، لە زۆرێک لەشیعرەکانیان دا بانگهێشتیان بۆ برایەتی و پێکەوە ژیان لەگەڵ گەلانی دراوسێمان (تورک و عەرەب و فارس) کردووە. قەدری جانیش یەکێ لەو شاعیرانەبووە، کەهەمیشە ئەم بانگەوازەی ڕاگەیاندووە، وەک دەڵێت:

ئازادی ئو برایی  
ئاسایش ئو ئاشیتی...  
لناڤ حەموو وەلاتان،  
ل هەرجی ئو جیهاتان  
دۆستانیک بێ گومان،  
ل ناڤ ملەتێ جیهان..  
ببەقانوون و دەستوور  
ل ناڤ گەلێ گرو هوور  
ب دل ب جان و گیان

ئینسان... برایی ئینسان
ئینسان... برایی ئینسان.[١]

بەچاوێکی برایانە، تەماشای گەلە ژێر دەستەکان دەکات، کە لە شیعرێکی دا، گەشتێک بۆ رابردوو دەکات، بۆ ئەو سەردەمەی کە کوردو عەرەب و عەجەم و تورک هەر هەموویان لە ژێر دەستی رۆژئاوابوون (ئینگلیز، فەرەنسا...تاد) کەتا ئەم دوایانەش لە دوژمنایەتی گەلانی رۆژهەڵات نەوەستاون، بۆیە شاعیر ئەم رەوشەیان بەبیردێنێتەوە و رووی دەمی دەکاتە ئەم میللەتە زۆرلێکراوانە، ئەوەی شایانی باسیشە وشەی عەرەبی و تورکی و فارسی لە ناو شیعرەکەدا بەکاردێنێت، بۆ دەرخستنی زیاتر هاوسۆزییەکەی بەرامبەر برا (عەرەب و فارس و تورک) ەکان هەروەکو، دەڵێت:

ئەی برادەرێ عەجەم
اخوان عرب الأشم
ئەی یوکرات تورک قارداش
برادەر، ئیخوان، یولداش
ئەم هەڤال و جیرانن
دژمنێ ئەمریکانن
ئینگلیزن، ئینگلیز...
زینهار ژ وان مە بن لیز...[٢]

١- قەدری جان، چاردەی گەلاوێژ، گ: هیوا، ژ: ٣، بەغداد ١٩٥٨، ل٤٩ .
٢- مەسعود بارزانی، بارزانی والحرکه التحرریه الکردیه، الجزء٣، ١٩٨٧، ل٢٦٨ .

دیسان شاعیر لەپارچە شیعرێکی تری دا، هەمان بیروباوەڕی پێشتر دەخاتەڕوو کەخۆی (کورد)، بەهەڤاڵی عەرەب و چەرکەس و ئەرمەن دادەنێت و دەڵێت: هەمووومان یەک دڵمان هەیە لەیەکتر تێدەگەین، ئەویش زمانی دۆستایەتی و ئاشتییە:

سوارێ کەشتی بووم،
تەڤاپێنسەد هەڤاڵی،
هەر یەک ژ وان ژ من بێترب هەیەجان،
هنەک ژ وان عەرەبن
هنەک ژی چەرکەس ، کوردو ئەرمەنن...
لێ هەموو یەک زمان و یەک دلن،
زمانێ دۆستانی، ئاشیتی...[٣]

سەبارەت بەو شاعیرانەی کوردیش، ئەوانەی دوای جەنگی دووەمی جیهانی ژیاون وەکو (گۆران، بێکەس، پیرەمێرد و عەلی فەتاح دزەیی) ئەوا بەشێوەیەکی زۆر بەرچاو گیانی برایەتی کوردو عەرەب لە شیعری زۆرێکیان دا رەنگ دەداتەوە کە بێگومان ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ شۆڕشی گەلی عیراق بوو بەگشتی، هەروەها لە بەندێکی دەستووری ئەو کاتی کۆماری عیراق دا، هاتبوو کە کورد و عەرەب هاوبەشن لەم

٣- پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ، تاریخا ئەدەبیاتا کورد -١- ستۆکهۆلم. ١٩٨٣ ل١٨٧

نیشتمانەدا، بەشێوەیەکی کارەکیش کورد و عەرەب لەو کاتەدا بۆماوەیەک وەک برا دەژیان، بۆیە ئەم واقیعە لەشیعرەکانی ئەو شاعیرانەدا، بەرجەستەدەبوو، قەدری جانیش یەکێ بوو لەو شاعیرانە کەئەو بارودۆخەی زۆر بەدڵ بووە لەچەند شیعرێک ئاماژەی پێ کردووە کە ئەمەش هەڵوێستی مرۆڤ دۆستانەی شاعیر دەسەلمێنێت:

کوردو عەرەب بەبرایی
ل سەر رێیا ئاشتی
بەیەک دل و بەیەکجان
ئازاد کرن نیشتمان(٤)

بەرامبەر بە پەیڤی شەڕو ئاژاوە، ئاشتییە، کە رامان و راڤەکانی شەڕ بەسەریەکتر ئەروخێنن، هەروەها رق وکینەش بەرامبەریان دۆستایەتی و خۆشەویستییە، برایەتی و یەکگرتنیش سەنگی مەحەکی خۆڕاگرتن و بەرخودان وبەرەو پێشچوونە، ئامانجی سەرەکی ئەم سێ کوچکەیە شاعیر قووڵ دەکاتەوە، بەرامبەر یەک ئامانج کە ئەویش ئاشتییەویەکێکە لە خەسڵەتە پیرۆزەکانی مرۆڤ بەرامبەر بە مرۆڤایەتی، لەم فەزایە شادو دلڕفێنەدا زمانەکانی بێ ئاگایانە هاوار دەکەن بژی ئاشتی و دۆستایەتی:

ئەم گیهیشتن «ئودەسا»!
مەحشەرا براتی...

٤- قەدری جان، نامە بۆ ئێستگەهێ رادیۆ تاران، ر: ئازادی، ژ: ٤٦، کەرکووک ١٩٥٩ .

گروهـ- گروهـ خەلک، ژن، مێر، پیرو زارۆ
ل بەندێ مەبوون،
مینا کەرییێ بەرخ و مییان
ئەم ل سەر هەڤ کەلیان،
مە هەڤدو هەمێز دکر،
مە هەڤدو ماچ دکر،
ژ چاڤان هێسترێن کێفخوەشی و دلگەشی،
د هەرکێن سەر روویان.....
دەنگی «بژی ئاشیتی و دۆستانی»
دچوو ئەزمانان...[٥]

لە کۆتایی ئەم بابەتەدا منیش لەگەڵ بیرو بۆچوونەکەی زانایی ناوداری کورد پرۆفیسۆر (قەناتی کوردۆ)م کە دەڵێت: (هەر کەسێ ئەم شیعرانەی قەدری جان (ئەز دچم مۆسکۆ، بەگێ ئاخرزەمان، رییا تازە) بخوێنێتەوە دێتە سەر ئەو بڕوایەی کە قەدری جان بەم شیعرانە دەکەوێتە مەیدانی شیعری تێکۆشەرانی هەموو نەتەوەکانی ژێردەست، کە ئەویش وەک جگەرخوین بووەتە بازی سەربەستی و ئازادی، بووەتە هەڵۆی بانگەوازی دۆستی و هاوکاری نەتەوەکان، بووەتە دەنگبێژی ئاشتی نێو نەتەوەیی).[٦]

٥- پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٨ .
٦-هەمان سەرچاوە. ل١٨٧ .

# بەشی دووەم

## شاعیر و سەرکردە کوردەکان

هەموو گەلێکی چەوساوە پێویستی بە سەرکردەیەکی لێهاتووهەیە بۆ ئەوەی سەرکێشی بزاڤی رزگاریخوازی ئەو گەلە بکات. ئەگەر چاوێک بە مێژووی گەلانی جیهاندا بخشێنین دەبینین هەر میللەتێک چەند شۆڕشگێڕێکی لێهاتووی تێدا هەڵکەوتووە، بۆ بەرەو پێش بردنی کاروانی رزگاریی میللەتەکەی، ئەم شۆڕشگێڕانەش هەتا... هەتایێ لە دڵی میللەتەکانیاندا دەژین و دەبنە رەمزی هەمیشەییان، لەوانیش «غاندی وتیتوو گیڤاراو ماوتسی تۆنگ و ماندێلا... تاد». لە ناو کوردیشدا چەندین ناوی دیار دەبینین. کەوەک ئەستێرە لە ئاسمانی گەشی کوردستان دەدرەوشێنەوەو هەمیشە بوونەتە هەوێنی شیعری شاعیران بە تایبەتی ئەوانەی تادوا هەناسەی ژیانیان کۆڵیان نەداوەو لە بڕینی کاروانی رزگاری خوازیدا بەردەوام بوون، تەنانەت ژمارەیەکی زۆریان چوونەتە ژێر سێدارەی دوژمنان، لەم ناوە دیارانەش «شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، شێخ عەبدولسەلامی بارزانی، شێخ مەحموودی حەفید، شێخ سەعیدی پیران، پێشەوا (قازی محەمەد)، بارزانی نەمر... تاد» هەندێ لەم سەرکردانەش بوونەتە هەوێنی شیعرەکانی قەدری جانی نوێخوازو نیشتمانپەروەر. لە خوارەوەدا چەند نموونەیەک دەخەینە بەرچاو کە لە ویژدانی ئەم کەڵە شاعیرەدا رەنگیان داوەتەوە:

## پێشەوا قازی محەمەد (١٩٠٠-١٩٤٧)

روخانی کۆمارە ساواکەی کوردستان (کۆماری مەهاباد) کارەساتێکی هێندە جەرگ بڕ بوو کە هەموو کوردستانی هەژاند، ئەو کۆمارەی کەیەکەمین جار کورد سەربەخۆیی خۆی تێدا ئاشکرا کرد، ئەو سەردەمەش نەک تەنیا کوردەکانی کوردستانی ئێران، بەڵکو تێکڕای کوردەکانی کوردستان ئەو کۆمارەیان بەهی خۆیان زانی، بۆیە لەگەڵ روخانیدا چەندین شاعیر لە پارچەکانی تری کوردستان شیعریان بۆ هۆنیوەتەوە. لە هەمووشی جەرگ بڕتر لەسێدارەدانی پێشەوای قارەمان و چەندین قارەمانی تر بوو، لە رۆژی ١٩٤٧/٣/٣١دا، کە کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەسەر کەسانی خاوەن هەست و سۆزو ویژدان. شاعیریش یەکێک بوو لەو رۆشنبیرانەی کە ئەم خەمە زۆرکاری تێ کردووە، بۆیە جوانترین هۆنراوەی بۆ هۆنیتەوە، وەک دەڵێت:

ئەفسووس!... ئەفسووس!
چ دەردەکی گرانە!
برینەک بێ دەرمانە!
ژ دل نالین...
ژ دەڤ کالین...
هەزار ئاه، هەزار زارین
ژ چاڤێن مە هێسترین خوین
تێنە جۆش... تێنە خرۆش[1]

١- قەدری جان، شینا پێیشەوایی مەزن قازی محەمەد، و: ئەندازیار عەزیز بۆتانی، ر: العراق، ژ: ٢٨٢٠، ١٩٨٥ .

شاعیر تەنیا بەم پارچە شیعرەی سەرەوە کەل و کۆی دانەمرکاوە بەڵکو درێژە بە شیعرەکە دەدات و بەدەنگی بەرز هاوار دەکات و مژدەی پێ دەدات، ئەگەرچی تۆی رابەری ئێمەیان شەهید کرد، بەڵام ناوی تۆ هەمیشە لە ئاسمانی کوردستان وەک ئەستێرە دەدرەوشێتەوە، ئێمە ئەو بۆمبە ئەتۆمیەین کە گەرماییەکەی لەناو دڵماندایەوتۆ دروستت کردووە، هیچ کەسێک ناتوانێ ساردی بکاتەوە، تۆش ئەی شەهیدی ئەبەدی، ئۆغرت خێر بێ و سڵاومان بگەیەنە رێبوارانی ئەم رێبازە، بژی ناوی پیرۆزی ئێوە، بژی کوردستان، بەگیانی ئێوە مێژوو و داستانەکانمان ژیانەوە:

ئەی پێشەوایێ ناڤدار
دوژمن ئەگەر توکوشتێ
ناڤێ تە یێ پر شێرین،
هەتانی ئەبەد هشتێ
هەر جارا کو لنگێ وە،
سەر سەرێ وان کل دبوو
گیانێ وە بلندتر،
بەر ب ئەزمان هل دبوو،
ئەم دزانن..
هوون نە ئەوکەسێن کو هیچ بترسن
ل سێپایێ دوژمنان
تاکو دەڵێت:
ئەی شەهیدێن ئەبەدی

ئوغراوه یاخێرێ به
سەلامێ مه ل وان کن
هەرکی رێوی یێن ڤێ رێ نه
ناڤێ وه، ئەوێ بژی...
ئەوێ کوردستان بژی
گیانێ وه، د دیرۆک و داستانان ڤەژی.[٢]

له شیعرێکی تردا بەناوی (نامه بۆ ئێستگەهێ رادیۆ تاران) شاعیر روو له بێژەری ئەم رادیۆیه دەکات و پێی دەڵێت: مەگری بۆ ئەو کەسانەی که ئازادن، مەگری بۆ ئەو کەسانەی که دوورن له ئێش و ئازار، ئەگەر تۆ راست دەکەیت و کوردت خۆش دەوێ، بۆچی بۆ ئەو پێشەوایه ناگری که بەزۆری و دوژمنکارانه له سێدارەیان داو هیچ تاوانیشی نەبوو تەنیا ئەوه نەبێ داوای مافی رەوای گەلی ستەمدیدەی خۆی دەکرد، دەیویست گەلەکەی چیتر ژێر دەسته نەبێ و زۆری لێ نەکرێ، کاتێکیش که تووشی شکست هات گوتی: من دەمەوێ ببم بەقوربانی ئەم گەله باچیتر گەلەکەم نەکوژرێ و له ناونەچێ. ده بۆ ئەم شۆرشگێرەو ئەم سەرکردەیه بگری و بۆ کۆماری مەهابادی ساواو یەک ساڵه بگری بۆ پایتەختی وردوخاش کراو بگری، بۆئەو شوێنه بگری که پاشماوەی ناپاڵم و ئەتۆم و خەلوز گڕی زۆرداری لەسەری پەرش و بڵاوه، هەروەک دەڵێت:

بگری... بکه هاوار...
بو پێشەوایێ ل بن سەدار

٢- هەمان سەرچاوه.

مەگری بۆ کەسێ ئازاد
بگری بۆ، مەهاباد
بگری بۆ پایتەختێ تارومار
بگری بۆ ئەو پارچە: نیشتمانێ بریندار[٣]

٣- قـەدری جـان، نامـە بۆ ئێـســتگەهێ رادیۆ تاران، ر: ئازادی، ژ: ٤٦، کەرکووک ١٩٥٩ .

## بارزانی نەمر (١٩٠٣-١٩٧٩)

بارزانی سەرکردەو رابەرێکی دیکەیە، کە دەبێتە هەوێنی شیعرەکانی شاعیر، هەر بۆیە بە چاوێکی پیرۆز دەڕوانێتە بارزانی شۆڕشگێڕو پێشەوا، کە وەک سمبوولی خەبات خۆڕاگری پیشان دەدات، جێگایەکی تایبەتی و فراوانی لە ناو دڵە گەورەکەی خۆی بۆ داگیر دەکات، کاتێک بارزانی لەساڵی (١٩٤٧) داستانە مێژووییەکەی تۆمار دەکات و سنووری سوپای سێ دەوڵەتان دەبەزێنێ و دەچێتە یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، شاعیر لەخۆشەویستی سەرۆکی نەمر و داستانە قارەمانەکەی ئەم پارچە شیعرە دوورودرێژە دەهۆنێتەوە، کە دەڵێت:

بارزانی... بارزانی...
کی
ڤی
ناڤی
نزانی؟
هەرکەسی دیت،
هەرکەسی بهیست
ل رۆژهلات...
رۆژهلاتا ناڤین...
زڤستان و هاڤین..
کی دکە جەنگ؟ کی دکە خەبات؟
ل هەمبەری چەند دەولەتان،
ئەو دژمنێ ملەتان،

چەند دەولەتێن ئیستعمار
کی بۆیە کەلەم؟ کی بۆیە بار[٤]

هەروەکو لە پێشەوەش ئاماژەمان بۆ کرد، ئەم شیعرە هونەرمەندی دەنگ خۆش «شەماڵ سائیب» کردبووی بەسروود، ئەم سرووده ببووە سروودی سەرزاری هەموو پێشمەرگەو شۆڕشگێڕانی کوردو کوردستان. لەم بارەیەوەش جگەرخوێن دەڵێت: «تەنێ رستاوی (واتە قەدیری جان ئا.ع) «بارزانی، بارزانی» د ناڤ مللەت دە گەلەک دەنگ دایەو ل شەریتێن قاوانا هاتییە خستن».[٥]

هەروەها لەپارچەیەکی دیکەیدا داوا لەگەلی کورد دەکات کەلەدەوری سەرۆک و شۆڕشەکەی کۆببنەوە و لافی ئازادی و سەربەستی لێ بدەن، چونکە بارزانی بە رزگارکەری گەلی ستەمدیدەی کوردستان دەزانێت، بۆیە دەڵێت:

سەردارێ مە، بارزانی
گەرەک هەر کەس بزانی
سەردارێ ئازادی یە...
ناڤدارێ ئابادی یە ...
رابن هوون ژی بلڤن،
ل دۆرا وی بچڤن
بێژن... بژی بارزانی...

٤- مسعود بارزانی، بارزانی الحركه التحرريه الكرديه، الجزء (٣)، كوردستان، ١٩٨٧، ص٢٦٧ .
٥- جگەرخوین، ژینەنیگاریامن، ئاپەک، سوید، ١٩٩٥، ل١٩٨ .

خەلاسکارێ ئینسانی![٦]

کاتێ بارزانی نەمر دەگەڕێتەوە باوەشی ولاّت،شاعیر لە پێشوازی کردنیدا، شیعرێکی بە ناوی: (شێرهات وەلات... بارزانی هات) دادەڕێژێ و لەم پارچە شیعرەدا هیواو ئومێدی بە ئازادی ولاّت و سەرکەوتنی میللەت زیندوودەبێتەوە، مژدە دەداتە گەلی کوردستان کە بارزانی شێری کوردو کوردستان گەڕایەوە خاکی ولاّت و ڕۆژی کوردستان هەلاّت:

مزگین... مزگین گەلی کوردان
ڕۆژا کوردستانێ هەلات...
بارزانی هاتە نیشتمان،
شێرهات وەلات... شێرهات وەلات
مزگین ل وە، بارزانی هات... [٧]

پاشان درێژە بە شیعرەکە دەدات و دووپاتی دەکاتەوە کە لە دوای ئاوارەبوونی بارزانی، چیایەکان و باغەکانی کوردستان هەر هەموویان بێ دەنگ و بێ ڕەنگ بوون. جێگای شێران بە بەتاڵی مابوو، شین و گریان بەسەر هەموو کوردستاندا زاڵ ببوو، کوڕو کچانی ولاّت هەموویان بەپەرێشانی لە ماڵ کەوتبوون، شاعیر دەخوازێ چوونی بارزانی بۆ ولاّتی یەکێتی سۆڤیەت، گەڕان بێ بە

٦- مسعود بارزانی، المصدر السابق، ص٢٦٧ .
٧- قەدری جان، شێرێ وەلات... بارزانی هات، گ: هیوا، ژ: ٤، بەغدا ١٩٥٨، ل٧٦

دوای دەرمانێک بۆ چارەسەرکردنی دەردی وڵات هەروەکو دەڵێت:

نەخویابۆ، ژ چەند سالان
ژ بۆنا دەردێ نیشتمان،
چوو بۆ دگەڕیا، ل دەرمان
رۆژا کوردستانێ هەلات...
شێرهات وەلات... شێرهات وەلات...
مزگینێ ل وە، بارزانی هات...[٨]

هەروەکو چۆن قازی محەمەد ئاڵای کوردستانی بە بارزانی سپاردو پێی گوت: «ئەمە دروشمی کوردستانە دەیدەمە دەستت ئەمانەت بێ لە ئەستۆی تۆ، چونکە بەڕای من تۆ باشترین کەسی کە بیپارێزی[٩]». شاعیریش لە پارچە شیعرێکی نایابیدا ئەم مەبەستە دەردەبڕێت و بەئاشکرایێ دەیداتە خویا کردن کە بارزانی هیواو ئاواتی کوردە و بەدەست و بازووەکانی ئەو وپێشمەرگەکانی، کوردستان رزگار دەبێ و کورد بەئامانجی خۆی دەگات، وەک دەڵێت:

هەر بژی شۆڕەشا مە
شۆڕەشا مە بێ بژی
بەرزانی و پێشمەرگە
هێڤیا نوە ڤەژیاندن[١٠]

٨- هەمان سەرچاوە: ل٧٦ .
٩- مومتاز حەیدەری و نەژاد عەزیز سورمێ، کۆنگرەی ٩٠ ساڵەی لەدایکبوونی بارزانی نەمر، سەلاحەددین، ١٩٩٣، ل٦٦.
١٠- دلاوەرێ زەنگی، نڤیسکارێ کورد قەدری جان، (دەستنووس).

## شاعیر و رۆشنبیرو نووسەرانی کورد

پێشتر باسی ئەوەمان کرد، کە شاعیر هەمیشە ستایشی سەرکردەو رابەرانی کوردی کردووە، لە هەمووکات و شوێنێکا، کە بەڵگەی زیندووی هەستی نیشتمانپەروەری شاعیر بە ئاشکرایی دەری خستووە، بەڵام ئەوەی ئەم هەستە زیاتر روون دەکاتەوە، پێوەندی کردنی شاعیرە بە رۆشنبیرو شاعیرەکان کە لەسەردەمی خۆی کاری لەگەڵیاندا کردووەو لە مەیدانی بەرەوپێش چوونی کەلتووری کوردی وەک دەرکردنی چەندین رۆژنامەو گۆڤاری کوردی بەشدارییان کردووە، ئەم شاعیرو رۆشنبیرانەش چ ئەوانەی شاعیر هەڵبەستی پێ هەڵگوتوون و ئەوانیش وەڵامیان داپێتەوە، یاخود ئەوانەی لەمەڕ هەڵوێستە جوانەکانی شاعیر شیعریان بۆ هۆنیبێتەوە، وەک: (ئەمین عالی بەگ، شێخ عەبدولڕەحمان گارسی، جەلادەت بەدرخان، جگەرخوێن، لاوێ فندی، عوسمان سەبری، عیزەت ئاغایێ دیرکی... تاد) کە دەمانەوێت بە چەند لاپەڕەیەک باسیان بکەین:

### شێخ عەبدولڕەحمانێ گارسی (١٨٧٧ - ١٩٣٢)

شێخ عەبدولڕەحمانێ گارسی یەکێکە، لە ناوە دیارەکانی سەردەمی خۆی، لەبزاڤی رزگاریخوازی و رۆشنبیریی کوردیدا، کە مرۆڤێکی کوردپەروەر بووەو تا لە توانایدا بووە، بۆ کورد تێکۆشاوە، هەروەها یەکێک بووە لەو ژمارە یەکجار کەمەی زانایانی ئایینی، کە پشتگیرییان لە رێنووسی لاتینی کردووە،

جەلادەت بەدرخان لەم بارەیەوە دەڵێت: «گاڤا شێخ عەبدولڕەحمان گارسی فەتوادا کو کوردی ب لاتینی وەرە نڤیساندن، پرانییا فەقەهێن وی ب لاتینی دزانی».[1] قەدری جانیش هەمیشە زمانی شیعری بۆ ستایش کردنی کوردپەروەران ئامادەبووە، بۆیە دەبینین کەلە کاتی کۆچی دوایی کردنی گارسی وەک هەموو شاعیرانی تر، بەتایبەتی ئەوانەی لە دەوری (هاوار) کۆببوونەوە، شیعرێکی زۆر جوان لەسەر هەڵوێستی کوردانەی ئەو دەهۆنێتەوەو پێشکەشی گیانی ئەو کەڵەپیاوەی دەکات و دەڵێت:

تابووتەک دناڤا عەورەکی بخوین
مەلەکان کشاندن ئەزمانێ ژۆرین
ترسەکێ دا سەرمن لبتیم رجفین
بەرچاڤێ من رەش هات دلبۆرینم ئەز

ئەو تابووت، تابووتا عەڤدرەحمان بوو
سەر دنیا دەرەوین ئەو یەک مێڤان بوو
گەر تەرکی حەیات بوو، جەننەت مەکان بوو
ب رەحما وی شا بن هەمی کوردو ئەز[2]

## لاوێ فندی

عوسمانییەکان دوای رووخاندنی شۆرشی شێخ سەعیدی پیران و لە سێدارەدانی شێخ، دەستیان کرد بە رەشکوژی، تەنانەت

١- جەلادەت عالی بەدرخان، شین، گ: هاوار، ژ: ١١، شام، ١٩٣٢، ل٢ . (لاتینی)
٢- قەدری جان، تابوتا بخوین، گ: هاوار، ژ: ١١، شام، ١٩٣٢، ل٦ . (لاتینی)

دەستـــیـــان لە خـــوێنی منداڵ و ئافــرەتانیش هەڵنەگــرت، بەوەش نەوەســتــان و دەســتــیـــان کــرد بە رووخـــاندن و وێران کــردنی شـــارو گوندەکانی کوردستان، بۆیە کوردەکان پەرِاگەندەبوون و روویان کردە سنووری وڵاتە دراوسـێکان، ئەمــەش بووە هۆی ئەوەی کــە کــەس ئاگای لە کەس کاری نەمێنێ، نەباوک لە کوڕی، نەبرا لەبرای، بۆیە شاعیر هاوار دەکات و دەڵێت:

ئاخ وەلاتۆ ئاخ وەلاتۆ
رۆژا مە زوو لێ هەلاتۆ
باڤ وبرێن مە چاوانن
چما خەبەر ژێ نەهاتۆ[٣]

بەڵام کــــاتێ هەواڵی ئەم رەشکوژییـــــە، دەگـــــاتە یەک لەهاورێییــەکــانی کــە ناوی (لاوێ فندی)یە لە ژێرکــاریگەری ئەم شیعرەی کەتیایدا پرسیاری گەل و وڵاتی کردبوو و ئاگای لە خزم و کــەس و کــاری نەمابوو. هەسـتی راست گـۆیانەی خـۆی بۆ هەڤـاڵی خۆی دەردەبڕێت، لاوێ فندییش شیـعرێکی جوانی بۆ دەنووسێت و پرسیار بە پرسیار وەڵامی پرسیارەکانی دەداتەوەو دەڵێت:

ئاخ وەلاتۆ ئاخ وەلاتۆ
زولما نەیار ژێرا هاتۆ
عمرێ من چوو سی ساڵ ددیت
من نەدیت رۆژ لێ هلاتە
باڤ و برێن خوە دپرسی
ئیرۆ خەبەر ژ وان هاتۆ

٣- قەدری جان، خەونا هشـیـاریێ، گ: هاوار، ژ: ١٣، شام ١٩٣٢، ل٢ . (لاتینی)

تادەگاتە:

قەدری برا ئەڤ چ حالە — نە هۆگر مان نەهەڤالە
شینا ئیرۆ پڕ ل جی یە — هەتا قامەتێ [ل] بالە[٤]

**ئەمین عالی بەدرخان*** (١٨٥١-١٩٢٦)

ئەمین عالی بەدرخان مرۆڤێکی نەتەوەپەروەر و وڵات پارێزبوو، کە لە پێناو سەربەخۆیی گەل و وڵاتەکەیدا، هەموو ژیانی خۆی کردووبووە قوربانی، ناوبراو هیچ کاتێ سەری بۆ دوژمنان شۆڕنەکردو هەردەم وەک قەڵایەکی سەخت بەری لەداگیرکەران گرتووە، چونکە نەیویستووە بۆ ساتەوەختێک لەژێر چەپۆکی دوژمنانیدا بژیت، کە لەو پێناوەدا دەست لە خۆشەویستترین و پیرۆزترین شت هەڵدەگرێت و وڵاتی باب و باپیرانی بەجێ دێڵێت و روو لە وڵاتی شام دەکات، ئەم کەڵە پیاوە جگە لە کاری سیاسی، خامەی رەنگینی دەخاتە کارو بەپەیڤی کوردی شیعرو وتار دەنووسێت و لە گۆڤارەکانی سەردەمی خۆی بڵاوی دەکردنەوە، واتە سەرەڕای کاری سیاسی نووسەرو هۆزانڤانیش بووە، (دەلالیا

٤- لاوێ فندی، بەردێلک، گ: هاوار، ژ: ٢٢، شام ١٩٣٢، ل٩ . (لاتینی)

* ئەمین عالی بەدرخان کەناسراوە بە ئەمین بەگ کە دەکاتە باوکی جەلادەت و کامەران و سورەیا بەدرخان. لە ساڵی ١٨٥١ لە ئەستانبوڵ هاتۆتە دنیاوە، چەندجار لەسەر لایەنی سیاسی، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی دەستگیرکراوە، هەروەها جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی تەعالی کوردستان بووە، سەرەڕای کاری سیاسی شاعیریش بووەو چەندین شیعری جوانی هۆنیوەتەوە، لەساڵی ١٩٢٦ کۆچی دوای کردووەو چۆتە بەر رەحمەتی خوای گەورە.

زارۆکـان) یەکـێکە لە شـیـعـرە هەرە بەناوبانـگەکـانـی، کـە لەسـەر دەریایی ئەسـپـارتا، سـاڵی (١٩٠٦) نووسـیـویەتی و باسی خەم و ناخۆشـیـیـەکانی ئەوکـات دەکـات کە دەسـەڵاتدارانی ڕۆمـان (واتە تورکیا) چیان بەسەر گەلی کوردهێناوە هەموو ئەو غەم و ناخۆشیانە لە ناخی دڵدا دەگێرسانەوەو بەو وشە جوانانە ئەو نەخۆشیانەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

بنڤە خوەشییا دل و دو چاڤان،
دادێ ژ تە رە هەر رو نگەهبان،
دا زوو تومەزن ببی بەدرخان،
بنڤە کەزەبا من بنڤە لۆلۆ!![٥]

شاعیریش کۆپلە کۆپلە پێدادێت و بەپێچەوانەی ئەو، شیعرێک دەهۆنێـتـەوە، هەر وەکـو خـۆی لە پەراوێزی شـیـعـرەکـەدا دەڵێت: ئەم پارچە شـیـعـرە لەژێر دەلالیـا زارۆکـان هۆنراوەتەوە، بە دەنگ و هاوارێکی بەرز بە بەدرخـان دەڵـێت: (رابە) کـە ئەو (بنڤـە)ی بەکارهێناوەو پەنادەباتە بەر میر بەدرخان و پێی دەڵێت: گەلی کورد پێـویسـتـی بەڕابەرێکی وەکـو تۆ هەیە، بۆ ئەوەی لەژێر زوڵم و ستەمی ڕۆمان ڕزگاری ببێت، داوای لێ دەکات لەخەو هەڵسێتەوەو پرسـیـاری حـاڵیـان بکات، کـە لە چ مـەینەتی و چ ژیانێک دان، هەروەک دەڵێت:

٥- ئەمین عـالی بەدرخـان، دەلالیـا زاروان، گ: هاوار، ژ:٥، شـام، سـاڵی ١٩٣٢، ل٢ . (لاتینی)

رابە مێزەکە حەبەک ل دۆران،
تە خەو درێژکر، ئەم پڕ ل بەرمان
ئێدن مەزنی، لۆلۆ لاوە جان
رابە بەدرخان! دێ رابە لۆلۆ!!
پاشان بەردەوام دەبێت و دەڵێت:
چمان نابێژی، گەلۆ چ حالە،
سەبرا مە نەما، بنال، بکالە
رابە ژ مە رە مەیدان کەمالە
رابە بەدرخان، دێ رابە لۆلۆ!![6]

دووبارە کـردنەوەی (رابە بەدرخـان دێ رابە لۆلۆ!!) لە هەمـوو کۆپلەکانی شیعرەکەیدا پێداگرتنە لەسەر هەڵسانی رابەرێکی کورد، بۆ ئەوەی پێش گـەلی کـورد بکەوێت، چونکە کـورد پێـویسـتی بە رابەرێکی لێهاتووی وەک میر بەدرخان هەیە.

## میر جەلادەت بەدرخان* (١٨٩٣-١٩٥١)

جـەلادەت بەدرخـان یەکێ لەو ناوە دیارانەیە، کـە لە سـەردەمی

٦- قەدری جان، بەردێلک، گ: هاوار، ژ: ٦، شام،ساڵی١٩٣٢، ل٢ .(لاتینی).

(*) جـەلادەت ئالی بەدرخـان لە سـاڵی ١٨٩٣ لـە ئەسـتـانبـۆڵ هاتۆتە دونیـاوە، کـە دەکاتە کوڕی ئەمین بەدرخان پاشا، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە ئەستەمبۆڵ تەواو کردووە، لەساڵی ١٩٢٢ لەگەڵ برایەکەی کامەران بەدرخان بەرەو ئەڵمانیا دەچێت و لەوێ خوێندنی خـۆی کـۆتایی پێ دێنێ. سـاڵی ١٩٢٥ دەگـەڕێتـەوە بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆ ماوەیەکی کەم لەقاهیرە دەمێنێتەوەو پاشان بەرەو سوریا بەرێ دەکەوێ و لەوێ دەگیرسێتەوەو لە ساڵانی سییەکاندا چەند گۆڤارو رۆژنامە بڵاو دەکاتەوە، بەڵام بەداخەوە بە هۆی کارەساتێکی دڵتەزێن لە ١٠ی پوشپەڕی ١٩٥١ کۆچی دوایی دەکات.

خۆیدا، خزمەتێکی کجار زۆری کەلتوورو ئەدەبی کوردی کردووە، بەتایبەتی لە دەرکردنی گۆڤارو رۆژنامە... تاد شاعیریش بەم شێوەیە بیروڕای خۆی لەمەڕ هەڵوێستی میر جەلادەت دەردەخات: (خۆشەویستی ئەو بۆ وڵاتەکەی کوردستان پەیوەست بوونی بەلاوانی میللەتی کورد لای هەموو کەسێک دیارو ئاشکران و لە رۆژی نیوەڕۆ دیارن، مرۆڤێکی ئازاو بەجەرگ بوو، هێندە ئازاو بوێر بوو کە لەکاتی ناخۆشی و تەنگانەدا خۆی نەدەدایە پاش. بەڵێ لەکات و سەردەمی رۆژانی دان بەخودا گرتندا چەند بڵێی مرۆڤێکی روح سووک و نەرم و ئارامگربوو، بەهەشتی ئەگەرچی لە کۆنترین بنەماڵەی کورد بوو، بەڵام بەتەواوی دژی هەموو بیروباوەڕو بزووتنەوەی ئوروستوکراتی بوو. سۆسیالیست پەروەر بوو، تابڵێی مرۆڤێکی گەورە بوو، لەبەر ئەوە لەو باوەڕە دا بوو کە مرۆڤایەتی گەورەترین بڕوای بەرزە، هیچ شتێک بەسەریدا زاڵ نابێت. دڵ گەش و شاد و بەختیار دەبوو کاتێک کە لەدەستی دەهات هاوکاری هەژارو دەست کورتەکان بکات، جیاوازیی لە نێوان ئایین و نەژاد و توخم و توێژێکدا نەدەکرد). (٧) بەڵام بەداخەوە بەهۆی کارەساتێکی دڵتەزێن کۆچی دوایی کرد، وەفاداری شاعیرێکی، بۆ ئەم زاتە وای لێ کردووە ئەم شیعرەی خوارەوە پێشکەش بە گیانی پاکی بکات، کە لەسەر گۆڕەکەی نووسراوە:

میرێ کورد

لاوێ کوردستان

٧- سادق بهاءالدین، جەلادەت بەدرخان، گ: کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی حەوتەم، ١٩٨٠، ل٢٧٦ .

نەڤی یێ بەدرخان
جەلادەت،
فیداکار خوەدێ یێ هیمەت
جەندەکێ وی کر دڤر دە بن ئاخ بوو
گیانێ وی بلندی ئاسمان بوو..
د ریبیا نیشتمان
خوەدییێ پجان
گیانێ خوە کر قوربان
نە مری یە، زندییە...
ناڤێ وی ئەبەدی یە. (٨)

**جگەرخوێن***(١٩٠٣-١٩٨٤)

بێگومان روون و ئاشکرایە جگەرخوێن لەماوەی (٨٠) ساڵی تەمەنیدا، خزمەتێکی زۆری کوردو بزاڤی رزگاری خوازی کوردستانی کردووە، هەر لەمنداڵییەوە، ئاوارە بووەو هەر بەئاوارەییش لە ستۆکهۆڵمی پایتەختی وڵاتی (سوید) سەری نایەوە، شایانی ئاماژە پێ کردنە کە جگەرخوێن جگە لە خەباتی سیاسی چەکداری زیاتر لە (٢٥) کتێبی یشی چاپ کردووە، چەند

٨- ئەم پارچە هەڵبەستە لەسەرگۆڕی جەلادەت بەدرخان نووسراوە، هەڵبەستەکەش لە وێنەیەک وەرگیراوە، کە برای بەڕێز دیار دۆسکی: سەرنووسەری گۆڤاری (مەتین) بەدیاری پێشکەشی کردم.
(*) ناوی تەواوی (شێخ مووسە کوڕی حەسەن)، لە ساڵی ١٩٠٣ لە گوندی (حەسار) نزیک شاری ماردین لە دایک بووە، لەشەوی ٢٢-٢٣/١٠/١٩٨٤ کۆچی دوایی کردووە.

دەستنووسێکیشی هەیە لە بوارەکانی مێژووی کورد، ڕێزمانی کوردی، فەرهەنگ و زمان و شیعرو چیرۆک، پەیوەندی لەگەڵ قەدری جان دا هەبووە، هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد، ئەمەش وای لەجگەرخوێن کردووە کە شیعرێک بەناوی «دێرک» پێشکەش بە قەدری جان بکات کەتیایدا ستایشی دەکات و دەڵێت:

ئەی هەڤالۆ دەلالۆ، تۆ هەر تشتی دزانی
دزمانێ مە کوردانی تو وەک مەلایێ خانی
تو خورتەکی چەلەنگی ئەز کالەکی زەمانی
دل و گەردەن شکەستی بەندەوارێ خزانی
خوەدێ تە خوەش بهێلە، تو خۆرتەکی جوانی
تاکو دەڵێت:
دێرک چ خوەشە ب دارو ئاڤە
ئەڤ ئاڤە ل هەر، دەرێ بەلاڤە
یەک غابە، بەلێ بهوشتا مەئوا
پڕ مشمش وسێڤ و دارو سەلوا[٩]

قەدری جانیش بەم بۆنەیەوە، شیعرێک بەناوی «جگەرخوێن» دەهۆنێتەوەو، لێرەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە پەیوەندییان زۆر بەهێز و پتەوبووە، بۆیە بەشیعرێکی نازک و رند وەڵامەکە دەداتەوە و دەڵێت:

٩- ئەم شیعرەی لە گۆڤاری هاوار ژمارە (٥)دا بڵاوکردۆتەوەو، بەڵام سێ پارچەی دی لە پێنج خشتەکی بۆ زیاد دەکات و ناوەکەشی گۆڕیوەو کردوویەتییە «ژ قەدری جان رە». جگەر خوێن، پەسنادێرکێ، ژ/ هاوار، ژ/ ٥، شام ١٩٣٢، ل ٧ .

د دەما هەشێ من وەندا دبوویی
مزگینەک ژمن رە هات وگۆت: بخوین.
من جەگەر پەرتی، من دل هیلوویی،
مێزە کر ئەڤ مزگین ب ناڤێ جەگەرخوین
***
هەڤالێ خۆشەویست پەسنا گوندێ من،
ب ئاه و کەسەران پێشکێش ددی من.
ژ نوو ڤە پێتەک ئار، داسەر داغێ من.
دەردو کول تەڤدا بێن تەوشێ جەگەرخوین! (١٠)

## عوسمان سەبری *(١٩٠٥-١٩٩٣)

عوسمان سەبری یەکێکە لەشاعیرە ناودارەکانی کورد، کەپەیوەندی و دۆستایەتی لەگەڵ قەدری جاندا هەبووە، پەیوەندییەکەیان زۆر بەهێزبووە، بەبەڵگەی ئەوەی لەیەکەم گۆڤاری (هاوار)دا، پەخشانێکی لەژێر ناوی: (هاوار هەبە... گازی ل دوویە) بڵاوکردۆتەوەو وەک دیارییەک پێشکەش بە عوسمان

١٠- قەدری جان، جەگەرخوین، گ: هاوار، ژ:١٢، شام ١٩٣٢، ل٢ . (لاتینی)

(*) عوسمان سەبری لە ساڵی ١٩٠٥ لە کوردستانی باکوور، لە گوندی (نارنجی) سەر بە خێڵی «مردیس» لە دەڤەری ماردین هاتۆتە دونیاوە، لەساڵی ١٩٢٩ کاتی شۆڕشی شێخ سەعید تێکدەچێت، ناچار دەبێت بەرەو شام بکەوێتەڕێ، لەدەرچوونی گۆڤاری (هاوار)ی میر جەلادەت بەگ بەشیعر و وتار و چیرۆک بەشداری تێدادەکات، نازناویشی (ئاپۆ)بووە، لە تەمەنی (٨٨) ساڵیدا، لە ١١/ ١٠/١٩٩٣ ماڵئاوایی دەکات و دەچێتە ژێر رەحمەتی یەزدانی مەزن، لە گوندی بەرکەڤرێ لە ١٣/ ١٠/١٩٩٣ سەر بە شاری قامیشلو بە خاک دەسپێرێ.

سەبری کردووەو بەپارچە شیعرێک کۆتایی بەپەخشانەکە هێناوە، لەم بابەتەدا موژدەی دەرچوونی گۆڤاری (هاوار) بە عوسمان سەبری رادەگەیەنێت هەروەکو خۆی دەڵێت:

ژین چقاس دەلالە
دنێڤ باڤ و براندا
دل هەیە کو نە نانە
بەر برینێن رماندا[11]

کاتێک عوسمان سەبری چاوی بەم بابەتە دەکەوێت، زۆر خۆشحاڵ دەبێت، بۆیە خۆی پێ راناگیرێت و دەست دەداتە خامەکەی و بەجوانترین شیعر بە ناوی «بەردێلک»* وەڵامی «قەدری جان» دەداتەوە:

ژین خوەشە ب خورتی
ل کوردستان ب کوردان
باڤ و بران، چ بکم؟
هەموو من تێ ب دەردان.
***
من دل تو جار نەنالی
من زار تو جار نەکالی

١١- قەدری جان، (هاوار هەبە- گازی ل دوویە)، گۆڤاری: هاوار، ژ: (١)، شام، ١٩٣٢، ل٧ .

* جگە لەم پارچە شیعرە عوسمان سەبری شیعرێکی دیکەش بۆ قەدری جان کردووە دیاری کە بەناوی (سەرسالا من) کە لە ژمارە (٥٣) گۆڤاری هاوار ساڵی ١٩٤٣ بلاوی کردۆتەوە، کەچی شیعرەکە لە ١٩٣٣/١٢/٣١ نووسراوە.

ب دل هشکی ب لالی
سینگا خوه دا بەر رمان.(١٢)

بێجگە لەم شاعیرو رۆشنبیرانە، هی تریش هنە کە لاپەڕەکانی ژیانی بەسەرهاتی قەدری جان تۆماردەکەن، لەوانە عیزەت ئاغایێ دێرکی یە(*) وادیارە لەگەڵ شاعیر جگە لە هاوڕێیەتییان خەڵکی یەک زێدن، بۆیە لەوەفاداریدا شیعرێک بۆ گیانی پاکی دەهۆنێتەوەو لەسەر گۆڕەکەی دەبینووسێت کە خۆشیی کێلەکەی دروست کردووە، لێرەدا بەپێویستمان نەزانی پارچە شیعرەکە وەک نموونە بهێنینەوە و باسی بکەین، چونکە لەژیانی و بەسەرهاتی قەدری جان خستوومانەتەڕوو.

١٢- عوسمان سەبری، بەردێلک، گ: هاوار، ژ: ٢، شام سالی ١٩٣٢، ل١٠ . (لاتینی).
(*) عیزەت ئاغایێ دێرکی کە بە «عیزەت ئاغا» ناسراوە، ساڵی ١٩٢٠ لە کوردستانی باکوور، لەشاری «دێرک» هاتۆتە دنیاوە، بۆ ماوەیەک لە سوورگونی و موگرایێ درێژەی بەژیانی خۆی داوە، بەلام لە سالانی پەنجاکان ناچاردەبێت سەری خۆی هەڵگرێ و بەرەو شام بکەوێتەڕێ. بەداخەوەش لەتەمەنی (٥٩) ساڵیدا واتە ساڵی ١٩٧٩چووەتە بەر دلۆڤانی خوای مەزن.

## بەرهەمەکانی قەدری جان

لە راستیدا قەدری جان گەلێ بەرهەمی نایابی بەجێهێشتووە خامەکەی درێغی لە هیچ بابەتێکی فەرهەنگ و زانستی نەکردووە، لەژێر فاکتەری لێزانی و نەتەوە ئارایشیداو شان بەشانی شیعرە نەتەوەییەکانی خۆی داوە بەدەم لافاوی فرمێسک و خوێنەوە.

گرنگترین بەرهەمەکانی شاعیریش لەم بوارانەدا ئەمانەن:

١- رێبازی روسی، کە دانراوی (گریگۆری پێتروف)ە، قەدری جان بەسەر پەرشتی (د. ئەحمەد نافیز) وەریگێڕاوەتە سەرزمانی کوردی و ئەلقە بەئەلقە لە رۆژنامەی «رۆژانوو» کە لە ژمارە (٤-١٧) کۆتایی هاتووە، لەساڵی (١٩٤٤) تاکو (١٩٤٥)بڵاوی کردووتەوە، شایانی ئاماژەپێ کردنە، ئەم پەرتووکە هەمووی لەلایەن شاعیر بڵاونەکراوەتەوە و ئاماژەشی پێ نەکردووە، کەتەواو بووە یاخود هێشتان ماوە.

٢- شڤانی کورد، کەهی عەرەبی شەمۆیە و لە فەرەنسییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و بەپیتی لاتینی لەساڵی (١٩٤٧) لە بەیروت چاپی کردووە. شایانی باسە لە چاوپێکەتنێکی تایبەتیدا لەگەڵ هێژا دلاوەر زەنگی پێی راگەیاندم کە: «ئەم پەرتووکە هی قەدری جان نییە بەڵکو ئەو تەنیا هاریکاری کردووە.

٣- ئەلف با کوردی: تاکو ئێستا نەزانراوە ساڵی چەند

چاپکراوە، بەڵام لە هەندێ لە سەرچاوە ئاماژەیان پێ کردووە.

٤- داستانی بارزانی کە بە شیعر نووسراوە، لە ساڵی ١٩٤٧ لە وڵاتی شام چاپیکردووە. سەبارەت بەم داستانە دکتۆر احمەد دزەیی دەڵێت: «مامم(واتە عەلی فەتاح دزەیی ئا.ع) ئەم شیعرەی لەبەرکردبوو، زۆر حەزی لێ دەکردو هەر لەبەر خۆیەوە دەیگۆتەوە. بەسەرهاتی ئەم شیعرەش مامم بۆی گێڕامەوە: گوایە قەدریجان کاتی خۆی لەسەر کارتێکی یادگار رەنگاورەنگ نەخشراو نووسیبووی و چەندین دانەشی لەبەر گرتبۆوەو بەسەرکوردەکانی ئەوێ دابەش کردبوو، ئەوا دانەیەکی لای مامم، تا ئەو ساڵانەی دواییش هەر مابوو. منیش لەلای خۆم تۆمار کردووە لەدەفتەرێکدا. (بڕوانەی ماستەری مامۆستا بەکر شاکر).

٥- دیوانی شیعری لە ساڵی ١٩٥٧ لە سووریا چاپیکردووە. بەڵام هەتاوەکو ئێستا بەرچاونەکەوتووە. هەروەها لە هەمان چاوپێکەوتندا نووسەر دلاوەر زەنگی دەڵێت: (تو دیوانێن قەدری جان ل سووریێ نەهاتنە چاپکردن).

# هاوار هەبە. گازی ل دوویە

ژ بۆ نا برایێ من ئۆسمان سەبری

ژین چقاس دەلالە
د نێڤ باڤ و بران دا.
دل هەیە کو نە نالە
بەر برینێن رمان دا.
ئەڤ برینا رمانە؛
بارەکێ پر گرانە؛
کەزەب، گورچک نەمانە؛
ل پەپووکێن خوەهان دا.
هاوارا مە ڤایە،
خەوا بێکێر بەلایە،
قەت شک تێدا نەمایە،
دگوتنێن یاران دا.

* گوڤاری: هاوار، ژمارە: ١، سالی ١٩٣٢، ل٦ .

## بەردێلک (١)

ژ لۆریا بەدرخان رە.

رابە مێزەکە، حەبەک ل دۆران،
تە خەو درێژ کر، ئەم پر ل بەر مان
ئێدن مەزنی، لۆ لۆ لاوە جان
رابە بەدرخان! دێ رابە لۆلۆ!!

***

هشیار بە ئێدی، نهۆ پر قەنجە؛
ئاخا کوردستانێ، ژ تە رە گەنجە؛
پاشییا خەوێ، ب زانە رەنجە،
رابە بەدرخان! دێ رابە لۆلۆ!!

***

گورێ دەڤ ب خوین کەتە ناڤ بەرخان
ما نزانی بەرخ؟ بەرخ زارێ کوردان
بوونە ئارمانجا رمێن رۆمان
رابە بەدرخان، دێ رابە لۆلۆ!!

***

دەورا فەلەکێ. ئەگەر کو کینە،
رازان ژ مە رە، قەت ب کێر نینە
مەسکەن نەنڤین، دارو دەڤینە،
رابە بەدرخان، دێ رابە لۆلۆ!!

***

ئیرۆ نامووس، ئیرۆ غەیرەت

دەرو پۆغانان، ئەم بوونە عبرەت

ئێدن بەس نینە، دڤێ حەمبییەت

رابە بەدرخان! دێ رابە لۆلۆ!!

***

چەرخا فەلەکێ، ئەگەر نەسیمە،

پێشی کو هەرچەند، کۆزک کەمینە

چاڤێ خوە ڤەکە، خوەدێ کەریمە،

رابە بەدرخان، دێ رابە لۆلۆ!!

***

چما نابێژی، گەلۆ چ حالە،

سەبرا مە نەما، بنال، بکالە

رابە ژ مە رە، مەیدان کەمالە،

رابە بەدرخان، دێ رابە لۆلۆ!!

١- ئەم شـیـعـرە لە ژێر کـاریگەری تێکسـتـی هوزانەکـەی ئەمین عـالی بەدرخان کە بەناوی (دەلالییا زارۆکان)ە نووسیویەتی.

* گۆڤاری: هاوار: ژمارە ٦، سالّی، ١٩٣٢، ل٢ .

# هەسنکەر

هەسنکەرەک شەڤ و رۆژ، دخەبتی ژ دل، جان
خەباتا وی زنجیرەک، کو نا قەتە تو جاران
هەر جارەکێ کو چاکووچ، لێدخست دلخوەش دبوو
ئۆمێدا وی قەویتر، هێڤیا وی گەش دبوو
چەند رۆژ هۆلێ پێشڤەچوون، من ژی بالا خوە ددا
زنجیر هێ ئەو زنجیر بوو، دیسا وەکە خوە دما
***
ب وی چاکووچێ بچووک، ئەو زنجیرا قەراسە
ما تو جار تێ شکاندن، گەلۆ کی پێ هەساسە
چوومە ئەز نک هەسنکەر، من ژێ کرە پرسییار
ل بەر پرسییارا من، کارێ خوە کر حەبەک سار
-لۆ! مامێ منی دەلال، کەرەما خوە ئەرزان کە
دلۆپەک ژ دەردێ خوە، ژمن رە ژی نووش جان کە
هەر چەند بالا خوە ددم، ئەڤ چاکووچ و ئەڤ زنجیر،
تنێ بوویە دەردو کول، تشتەکی دن ناکەڤ بیر!
هەتا کەنگێ؟ تێ وسان، ب تەقین و رەقین کە
خێر گونەهێ ڤێ تۆقێ، ژ بەندە رە تەلقین کە.
***
-وەی سەرچاڤان تو هاتی، لۆ لاوکێ زەمانی

ژ خوه ئەز بووم چاڤنهێر، تە ب خوه کر خویانی
هێژ هەتانی ڤێ دەمێ، تو کەس نەهات ب مەراق
نەگۆتن گەلۆ چی یە، ئەڤ تەقین و ئەڤ تەراق
گوهدار ببە کورێ من، تو هێژایی خویایە
سرێ ژ تە ڤەشێرم، ئەو ژ بۆ من جەزایە
بەری یا من فەرزترە، گۆتنا باڤ وکالان
گەلەک ل جێ گۆتنە، رەحمەت ل وان ب باران
وان گۆتنە«بێ بێسەبر، تم تهن وتم بێ ئاڤ
هوورک هوورک ب دەرزیێ، قولتەین دبن ساردەلاڤ»
ئەڤ خەبات و جەهدا من گۆتنا باڤا نی یە
گەر ئیرۆ نەچە سەری، بۆ سبێ هێسا نی یە.
بێ ئومێدی نەقەنجە، تو دەستێ خوه ڤەماله
نەئەز زێدە خوەه بدم، نە تو بۆ من بناله
یەکدەست ئەم ب رەپین کن، هەڤال دبە (ذو الجلال)
برا تۆڤا دیلییێ، ببە پۆلایێ زەلال
ئەم ڤێ تۆڤا لانەتی، ژ سەرێ خوه بدەرخن
هنگێ برا ببینن، یا ئەم گورن یا بەرخن.

* گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ٧، ساڵی ١٩٣٢، ل٤-٥ .

## د شورەزارەکێ دە

ئەزو هەڤالەکی خوە ل سەر ڕێکێ دمەشن
ئەم ژ کێرا هاتنە کودا دچن؟ ناپرسن.
ژحالێن خوە دزانن ئەم، ڕێوینن قەدیمن
چقاس زەمان دبۆرە خوە بێ مەجال دبینن
سۆل د لنگێ مە نەما ، پرتینە جلێ مە
نەینۆکێ مە درێژن، بوونە گولی پۆرێ مە.
تنێ تشتێ ب مە رە کو وەکی بەرێ مانە
کەشکۆل گۆپالێن د مە، ئەڤان ب مە رە وەفانە
هێستریێن چاڤبەلۆق، جارنا د کەت لنگێ مە
ئێشا د ڤان میراتان داڤێت دا سەر دلێ مە.
گاڤا دبوو زڤستان مە رجف جانێ تازی
کو هاڤینا گەرم دهات بێ فێدە بکە گازی،
هێدی هێدی جانێ مە قەشم و قەرتیش دەردخە
بەر ئافاتان هین دبن، بڤی نەڤێ خوە ب خوە
ب ڤی حالی ئەم دچن، بێ ئەقلێ خوە بێ شعوور
ئەڤ ڕێیا ما بێ داوی پێشڤە دچوو دوور کو دوور
***
ڕۆژەک دیسان ژ ڕۆژان قەت حال دمە نەما بوو

نە گوند و نەگوندییەک ئەو جھ پێدا تەنها بوو
چما شووندا هنەک دەنگ هاتە ژ ناگیهانی
لێ بالا خوە ددمێ ئەو دەنگ پڕ کوور د نالی.
من دل کر کو ببێژم: مێزە بکی هەڤالۆ
مەگەر ئەو ژی بهیستی، کو گۆتە:
-ئەی دەلالۆ!
ئەڤ چ دەنگە دنالە؟ گەلۆ ل ڤی جهێ ها
نەبە ئەو ژی وەکە مە کەرامپەرێ بەر ب با.
***
وسان دەرکەت تەخمینا هەڤالۆکێ نکتەدان
بەخت رەشەکی کوردمانج بوو، دکر ئاخ و ئۆخ ئامان
من ژێ رە گۆت:
-ئەی برا تە چ حال و حەوالە؟
چمان وسان ل ئەردێ ڤەکەتی و دنالە؟
وی ژی ل من ڤەگەراند، گۆت:
-«دەردێ من گرانە،
چیرۆکا من درێژە، بێت نڤیسین رۆمانە
ئەز ژ کوردێن سەرحەدێ؛ مەلازگرە گوندێ من
ئەز دەرکەتی هەفت سالە، ب هش و ب دلێ من
زمانێ مە بوو سەبەب، بوو فەلاکەت ژ بۆ مە
مرۆڤێن چاڤسۆر هاتن، ژێ رە دگۆتن: رۆمە
زمانێ مەیی دەلال «یاساخ» کرن ب زۆری
زمانێ خوێی خوار بۆ مە کرن مەجبووری

ئێدن جورمەک مەزن بوو، ب کوردمانجی خەبەردان
گوهـ نەدانی هەدێ کێ؟ هەسپ و سونگی و زیندان
ئێدن وسان نەدبوو، مە چەندەکان خوە کارکر
ل هەمبەری دژمنان مە هەسپێ خوە پڕ غار کر
لێ... فەلەکێ ب مە رە نەبر سەرێ ئەم قەلس مان
وەکە نۆکێن ل کەڤر ئەم ل دەران بێکەس مان
دێ و باڤێ من هەمی ب تەڤایی وەندانە
- هەڤالێ منێ ئەول خوە ئاڤێتە ناڤ-
-گەلۆ تو قەت نزانی ل کیژان ئالی مانە؟
لۆ؛ براۆ! زنارۆ چمان تومن ناس ناکی
ئەز فەرزەندێ برامە، ئەمن ژ دێ و باڤکی»
***
هەردوو بران همبێز بوون ب کول گری و کەسەر
عەردو ئەزمان هەژییان، ئاگر کەتە داروبەر.

گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ١٠، ساڵی، ١٩٣٢، ل٤-٥ .

# تابووتا بخوین

شێخ عەڤدڕەحمانێ گاسی جوو ڕەحمەتێ

ل عەردێ دنێرم دلۆپێن خوینێ
ددمە سەر شۆپێ چ ببینم ئەز
دارو بەر، کەڤرو کوچ گش دکن شینێ
بێ حەمدی جانێ خوە دقیرینم ئەز.
***
تابووتەک دناڤا عەورەکی بخوین
مەلەکان کشاندن ئەزمانێ ژۆرین
ترسەکێ دا سەر من لبتیم رجفین
بەر چاڤێ من رەش هات دلبۆرینم ئەز
***
ئەو تابووت، تابووتا عەڤدڕەحمان بوو
سەر دنیا دەرەوین ئەو یەک مێڤان بوو
گەر تەرکی حەیات بوو، جەننەت مەکان بوو
ب رەحما وی شا بن هەمی کوردو ئەز
***
لێ سەد حەیف ژ بۆ تە ئەی رەحمان شێخم
چڤاسی کورد هەنە ژ بۆ تە بێخم

تێلەکی گازیێ، ولێخم، لێخم
ئەو هاوار هندکە ژێ تێرنابم ئەز
***
شەهادەت، مە نەدیت وسان ب عبرەت
جینایەت، خیانەت وسان ب رقەت
ژ بونا مرۆڤێ خوەدان حەمیەت
تاریخا رۆژا تە شین! قەید دکم ئەز

* گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ١١، ساڵی ١٩٣٢، ل٦ .

# جەگەرخوین

د دەما هەشێ من وەندا دبوویی
مزگینەک ژ من رە هات و گۆت: بخوین.
من جەگەر پەرتی، من دل هیلۆیی،
مێزە کر ئەڤ مزگین ب ناڤێ جەگەرخوین
***
هەڤالێ خۆشەویست پەسنا گوندێ من،
ب ئاه و کەسەران پێشکێش ددی من.
ژ نوو ڤە پێتەک ئار، داسەر داغێ من.
دەردو کول تەڤدا یێن تەوشێ جەگەرخوین!
***
دێرک پڕ خوەشە هێژایە پەسنێ؛
چ بکم ناکەڤ دەست؛ ژ بەر ڤێ خەسمێ
ب دل بریندارن کوردێن ڤێ نەسلێ،
نە ئەز و تو تەنێ هەمی جەگەرخوین!
***
ما مادەن هندکە ژ دارێن بەران،
ئۆسمانیە سێوەرک، مووشا- سەرحەدان.
ژ چیایێ تورۆزێ حەتا دەشتا- رەوان،
گش غابن! هن چێتر بزان جەگەرخوین.

***
دزانم تو زانی، وەلات گش خوەشە،
هن باژار هەنە کو تو لێ نامەشە،
مەسەلا ئەلەزیز چ لاو کەلەشە.
بدیتا ب چاڤێ شهرێ جەگەرخوین.
***
هەڤالۆ تو خوەش بی؛ تم ب دلێ خوە،
وەلاتێ بهوشتین تم ب سازێ خوە،
ساز بکی دناڤا تلییێن دەستێ خوە،
دا نەزان بزانن تویی جەگەرخوین...

* گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ١٢، ساڵی، ١٩٣٢، ل٢ .

# خەونا هشیاریێ

ئاخ وەلاتۆ ئاخ وەلاتۆ
رۆژا مە زوو لێ هلاتۆ
باڤ و برێن مە چاوانن
چما خەبەر ژێ نەهاتۆ
**
ئیشەڤ من دیت خەونەک بترس
تو کەرەمکە ژ من بپرس
ئەز جارەکێ دەست پێ بکم
دا تو ببین چڤاس ب حرس
**
بایەکی رەش هاتە ژ ژۆر
ل سەر من کرە بۆرەبۆر
ب گرین دا کاغزەکی سۆر
دناڤ هەبوون دو تایێن پۆر
**
ئەز چوومە جەم پیرەک زەمان
من گۆت: فالەکێ ڤەکی ئەمان
من دایە دەر تەڤ رووح و جان
دەردێ من رە ببێ دەرمان

**

پیرێ بۆ من رابوو سەر خوە

پیانا ئاڤێ دا بەر خوە

ل ئاڤێ خوەند ل من نێری

دیسا سەرێ خوە دا بەر خوە

کاغز ب خوینا بران بوو

هەردوو تاپۆرێن خوەهان بوو

مانا وان کوورو گران بوو

ژ فالا پیرێ نهان بوو

**

براییێن مە تێنە کوشتن

ب خوینێن خوە تێنە شوشتن

خوەهان پۆرێ خوە شاندنە

یانی «چما هوون روونشتن»

**

ئیرۆ لاشم پڕ دئێشە

قەنج دزانم ژ چ دێشە

لێ چ بکم دەرمان نینە

تالع تونە بەختێ رەشە

**

دەرمانێ کو ئەز کەشف دکم

ب هێڤینا خوە گەش دکم

ژ دلبرینێن وەک خوە رە

پەلێن هاوارێ رەش دکم

**

قەدری ببێژە و بنالە

شینێ گرێدە بکالە

نامووس نەما ، روومەت نەما

ئەڤ چ دەردو ئەڤ چ حالە

گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ١٣ ، سالّی، ١٩٣٢، ل٢ .

## دادێ

بوهارا ژینا من بێ تە پایزە دادێ،
بۆ من دیارێ جەنەت ب تە فایزە دادێ.
چێلکەوا لنگ شکەستی ل پێ هەڤالێن خوە ما ،
چێلکەو ئەز بم و نەگریم ماقەی جایزە دادێ!
***
دادێ پڕ کوور مەناله ، تە جەگەر ل من نەهشت،
دەوسا کەن و لۆرنێ ئاه و زارینا خوە هشت،
گرین ترسێ ددە من، خەراب دکە سینگ و پشت،
ئێدن خوین، کێمێ دزێن! کانی.. کاریزە دادێ.
***
هەر چەند پۆل و پەتالێن ژ بەر خانوو مانان مان
گەلەک قەنج گرێ بدە ل برینێن خوە ئەمان!
بژیشکێن مە چێدکن ژ بۆ دەردێ تە دەرمان،
هنەک ژ ڤان سەکبانن، هن ژی نافیزە دادێ.
***
داو نە ما مە ماچیکر، پاقژ نە پاقژ بە دەست
هەر کێ ئەڤ حالێ مە دیت گۆتن «پارسەکی یە ، گەشت»
دە وەر ژ بەر ڤی دەردی مە بە پەریشان و مەست،
نەعەقل ما نە شعوور، نە ژی حافیزە دادێ.

***

خوارن، ڤه خوارن تونه هەبه ژی مه سۆند خواری

پارییەک ب هێسانی د قرکا مه ناری

دیتنا ته میەسەر نەکە خودایێ باری

گاڤ و دەمێن مه حەمی، رۆژی.. پەهریزە دادێ.

***

ژ بەر کێمانییێن خوە، ل جەم ته شەرمزارن

تەنێ تو کوور مەناله، ئەم ژ ته هێڤیدارن،

ژ چاڤێن مه یێن مەلوول هێسترێن خوین دبارن

ژانا زراڤ تۆڤ مه کە، ئەمان! پاکیزە دادێ.

* گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ١٤، ساڵی، ١٩٣٢، ل٣ .

# دەست ژێ بوو

دلێ من ب کول چاڤ ژی ب هێستر
دەرد ژ دەرد زێدە غەم ژ غەم بێتر
فەلەکێ ڤاژی چەرخا خوە گەراند
لەیلاو مەجنوون ژ نک هەڤ قەتاند
ئەز مەجنوون رێوی، ل دوو ما لەیلا
ل دوو ما ل دوو یارا دلا
ئەی یارا ژ من جەگەر دل دزی
ئەی ئاخا تێدە بیرێن من رزی
ئەی کەڤر کوچێن گوواه ژ بۆ مە
ئەڤینا بێ دۆم تەباه ژ بۆ مە
ئەی شاما شەریف ئەردێ مقەدەس
ب خاترخوازی دچم! ئێدن بەس
ئەز دچم رهێ من ژی ما با وە
گەر من گۆت «بەس» ب دلێ خاڤە.
ژ لەورا من گۆت، مە بن قەت رازی
حەقیقی نینە. بەلکی مەجازی..
***
خوەش رەڤا د مە یانی «تمۆمیل»
هەرکی گاڤا فەنا ئاڤا نیل
بێ پیڤان نەوال و دەشت دا بەر خوە

بێ هێژمار خەمێن من ژی دا سەر خوە
گاھ سەرژێر گاھ ژ فتەلەک و هەڤراز
لەیلانن خویا وەک من دل پەرواز
جارجارنان جهێن خویا دکرن
بەرگەهێن شهرێ ئەحیا دکرن
جارنان ژی ئەڤ جھ پێدا بێ رێوی
وەک دەشتا دلم رەبەن و سێوی
پێلەکە وسان دچوو، هەم بێ دەنگ
من گەرەک نین بوو ئەو تەرز نەقش و رەنگ
من دخوەست دنیا تم تم کەرو لال
ژ بۆنا حالێ منی پورمەلال
کو تمی مژوول ببت ب جانان
خەیالەتێن یار نە رەڤ ژ چاڤان
ئەز خلماش بوو بووم؛ خەیالێ یارێ
ئەز همبێز کربووم نۆلا هەر جارێ
ئەم ب هەڤ شابوون مە هەڤ دکر پووس
دەنگەکی هشیار کرم ئاخ! ئەفسوس...
ڤی دەنگی دگۆت «ئەها ئەڤ همس
ئەڤا یە جهێ تە لێ دکت پرس»
من نێری کاشۆ ئەڤ ژی باژارەک
چ باژار! یارەب، ئەڤ خەراب وارەک
نزانم ژ بەر ئەقلێ مشەوەش
سەر و بەر مینا بەختێ منی رەش
***
بیستەکێ شووندا ئەم ب رێ کەتن

داوەت و زرنە ژ نوو لێکەتن:
ب دەنگێ ئەوران باران هاتە خوار
ب سازێ باکی ئەز بووم تارومار
رکرکێن دران و لێڤ ژ سەرما
حەتانی مە گۆت باژارێ حەما
دنێ ژی ئێدن تاری دبوویی
حەتا کو مەگۆت: ئەڤ حەلەب.
ژ لاشی چوو جان، تەوش وبێ سەبەب
وێ شەڤێ دناڤ مێڤانخانێکێ
هەش ژ من چوو بوو خەولەتخانەکێ
سبەهێ ب چەند هێسترێن چاڤان
من دا سەر رێیا کانییا عەرەبان
خەیالێ جانی دیسان ل هەنبەر
لێ ڤێجار هێدی هێدی رووشەنزەر
دحەلە و تێ دکەڤە دلێ من
ئەڤ سرا یەکجار نەکەت سەرێ من
دەمەکێ وسان، هات و بوو خویا
ل شوونا خەیێل ئەسەر ژی نەما
ژ لەورا ب چاڤ دیتن نەما بوو
دلێ من تەنێ ژێر هێلێن مابوو.

کانییا عەرەبان: ١٩٣٣/٢/٤
گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ١٦، سالّی ١٩٣٣، ل٤ .

## جوهابا لاوانی ل دیبیا هاواریٚ

دادیٚ! دادیٚ هاواریٚ
رۆما ، نان ژ بەر خواریٚ
گەلەکی ئەز کێفخوەش بووم
ژ بەر تە پرسیاریٚ
**
ڤێگاڤ حالێ من قەنجە
ئەڤ ئەرد ژ من رە گەنجە
ئەڤ حال وسان بمینە
پاشێ تو جار نە رەنجە
**
فەرهەنگا من پڕ دبە
هەرۆ زێدەتر دبە
جەمەد ل ڤر کاک دبە
مەقاس ژی جاوبر دبە
**
ئاپێ (هرچۆ) دبێژە:
«ژ میر (جەلۆ) رە بێژە
هاواریٚ پەسن نەهشت
کچک! کر کەسێ هێژە

**
ئەو میرێن گەلێی گویان،
کو سواران بەری پەیان
دخوون ب ئەقلمەندی
گەرەک ئەڤ بن بەیان
**
دگەل ڤێ تونەبوونێ
دگەل ڤێ قاسیبوونێ
سپاسان پێشکێش دکم
ب ئاوێ عەشیربوونێ»
**
کەکێ «بۆز» ل سەر دکە:
«ژ مە رە سەروەر مەکە
ئەم، گش کوردین! خوینا تورک
ژ بۆ مە رەهوان بکە»
**
ئەز بێمە سەر فکرا خوە،
گۆتن و ئارمانجا خوە
بهنا من پڕ فرەهـ بوو
ب گۆتنێن دییا خوە.

* گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ٢٠ سالی ١٩٣٣، ل١١ .

# هەی.. دنیا فانی

هەی دنیا فانی.. هەی دنیا فانی.
یێ کو تو چێکر قانوونەک دانی
گۆت: «هەرچی بایێ عەشقێ ل وانی
گەرەک تم بژین ب شادیمانی»
مخابن، هەیهات! ئەو گۆتن نەما
ئەو پەیمان زوودا کەت ئاڤێن چەما
هەی دنیا فانی.. هەی دنیا فانی
لال مەبە وسان ئەو قەرار کانی؟
ب هێژمارا ئیرۆ شەش و نیڤ مەهن
نەوزاد و نوهبر ل دۆرێ هەڤن
هەی دنیا فانی.. هەی دنیا فانی،
ل مە عاشقان کا دلۆڤانی؟
نزانم چ بوو ئەو بەژنا زراڤ؟
پەیدا کرن ل من ئاخ! ژانا زراڤ،
هەی دنیا فانی.. هەی دنیا فانی؟
ئەو شەنگ و شۆخێ قامەتێ کانی
هش ل من نەهشت قەت نابن شیفا
ئەو چاڤێن د رەش حەزینا وەفا
هەی دنیا فانی.. هەی دنیا فانی

پڕ مەلوول مەکە ڤی شبرین جانی
ئەو رەخێن رویان وەک سێڤێن خەلات
سۆرو زەر دبوون هەر لێ رۆژهلات
هەی دنیا فانی.. هەی دنیا فانی
ئیرۆ دۆر کەتم ژ وی زەمانی
وێ عشقێ وەی واخ! گرفتار کرم
ئەڤینەک نوه بوو بریندار کرم
هەی دنیا فانی.. هەی دنیا فانی
دەیندارا یارێ دەرمانێ جانی
ئاخ مەکە (نەوزاد) ژ بۆ تە شەرمە
داوییا واهێ پەرتاکە گەرمە
هەی دنیا فانی.. هەی دنیا فانی
زێرۆ زبەر بە ئەو چەرخا خامێ

* گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ٢٢، ساڵی ١٩٣٣، ل٧ .

# دێرک

دێرکـــا چیـــایێ مـــازی
وەلاتـێ بـاڤ وکــــــــالـە
لێ ســـەد هاوار و گـــازی
ژێ دوور کــەتم چەند ســالە
**
ئـــەز ل وێ هــــاتم دنـــێ
وێ دەرگـــــووشـێ، هەژانـدم
هەی واخ هـەی مــــالا منـێ
دژمـنـان، ژێ رەڤـــــــانـدم
**
پەرچاکـــە ژ بهـــوشــــتێ
بەســـــرەکــــا زێرین وەلات
ئیـــرۆ دەست ناگـــەهشــــتێ
ئاخ و کـــەســـــەر ژ دل هات
**
بـاغ و باغـــچـــە بێ هەژمـــار
جی ب جی مـــێـــرگ و زەڤی
ل هەر دەرێ، ئاڤـــێـن ســــار
ژ کــــانـیـــــیــــا تێ دزی

**
کولێبه بوویه خۆپان
دەنگێ بەرێ ژێ نایێ
تەماشاگاها خۆرتان
ژ من ژی سێوی مایێ
**
ژ چیچەکێ رەنگە رەنگ
سەرمەست نەوالا گۆڤی
چما ئیرۆ ناکی دەنگ
مینا تەبایێ کووڤی
**
خوەزی ڤێ جارێ ژی من
سەرێ خابێ بدیتا
بلا روهستین جانێ من
هنگێ ژ خوە رە بمێتا
**
دلێ من ژێ تێر نەبوو
ئاخ! ئەو ئاسراکا بەرخێر
گەلۆ ئەو رۆژ هەیە کو
دیسا ببینم ب خێر
**
گوهەر هێسا نەدبوو
ژ کەچێن هوستوو ب مۆری

چاڤێ مـن ل وێ ڤـــــەبوو
دلـێ مـن ژێ را گـــــــۆری
**
مــانجــێل و کـــانی-هنار
گـــــــۆرنـێ بیـــــرێ مـنن
ئیـــرۆ ببـــە پرســـیـــار
جـــــــوواهـێ دەردێ مـنن
**
رەها-رەش و لاتـا-ســـــۆر
یەک ســۆرگـوله ، یەکـە مـۆر
بـین بـکـم ئـەز دۆر ب دۆر
تێــــر نابم هەتانـی گـــۆر
**
دو تەخـتێ قـیــزێ-قـرێل
هەمـــبـــەری هەڤ دنێـــرن
ل سەر وان خوەش قەلیسێل
گـــــــورچک و دل چەدبـن
**
خـــــوەدێ کــــــەرەم بـکرا
ب بـامـــــا تـەیرەکی باز
ل وان جـــــــه ل وان دەرا
بـــگــەرم پـــەرواز، پـــەرواز
**

دێرکـــا چیـــایێ مـــازی
وەلاتـێ بـاڤ و کـــــــالان
دیـتـنـا تـە دخـــــــوازی!
نـەوزاد: ژ تـەرا حـــــەیران

* گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ٢٤، ساڵی ١٩٣٤، ل٧ .

# ڕەشبەلەک

- ژخۆرتێن جەزیرێ ڕە -

گەرچی ئەز دووری وە مە، ئیرۆ، ئەرێ..
لێ ب دل ئەز با وە مە، مینا بەرێ.
هوون دزانن ئەز ژ بۆ چ دوور کەتیم،
هەرچی زانا دزانە ڤێ خەبەرێ.
ئەز ئەڤینێ شەکرێ شامێ نەبووم،
لێ ژ بەر ژانا کو دابوو جەگەرێ.
ئەز هەڤالێ وە مە، گەر دووری وە بم،
پارا من پێتر دبە ژ کەدەرێ.
یەک ڕۆژا کو من ب وەر دەرباس دکر،
نە دانی بیرا من سالێ بەرێ.
یەک نێرینا مێردین و بورجا بەلەک،
ب خوەدێ نادم ب «ئەسوەد حەجەر»ێ.
نەینووکا یەکی ژ وە نا گوهێرم،
ب هەزار «زێد» و ب هەزار «ئومەر»ێ.
ئەز گلی و گازنان ژ کێ بکم؟
نژدەڤانێ مە بوو بوون سوارێ کەرێ،
لێ بزانن ڕۆژەکە من ژی هەیە،
قەلەما نشتر ژ کالان ئێ دەرێ.

هنگی حیساب و کتاب تێتە کرن،
ژ جەورێن وێ دێلکا دەربەدەرێ.

١٩٤٣/٣/١٨

* رۆژنامەی: رۆژانوو، ژمارە:١، بیروت، ١٩٤٣، ل٢ .

# شین

ل سەر گیانێ مەحەممەدێ سەیدا

بوهارا عومرێ جوانی بێ گول و چیچەک هات ئیسال.
مـــۆڤکا دارا خـــۆرتانی نە بشکوڤی بوویە زەوال...
ئەڤ چ خەوا یەکجاری بوو کو دەستێ تە ژ مە قەتاند،
خوەزی تە زانی با خوەزی، ل دوو ئەم چەند بوون مەلال
ژ بۆ گـیـــانێ تە چقـاس شین و گـری بت هێـژایە،
مـــوخـــابنا جـــوانیێ، بەژن زراڤ، خـــورتێ دەلال.
وەفـاکـارێ هەڤـالێن خـوە، وەلات- پارێز ب راسـتی،
ددنێ دە من هێـژ نەدیت، ژ تە چێـتـر، قـەنجـتـر هەڤـال.
سـەلاڤێ من ژ دوور ل گـۆرنیـاتە وچیـایێ جـوودی
ئو ژ زەمـزەم پرەسـتـەشـتـر چەمێ دیجلێ ئاڤا زەلال...
هەگـەر تـو حـەسـرەت کـێشێ باڤ و برانی دبن ئاخێ،
ئەز ژی ل سـەر دنێ تەنـهـا مـامـە، ژ دل تێن نالەنال...
برا چاڤێ تـە ل دنێ نـە زیـڤـــــرە، زبـنـهـــــار، بـرا!
گش فانی یە، بێ داوی یە، پۆشمان مەبە باڤێ جەمال،
هەگـەر جـارەکێ تو مـری رۆژێ سـەدجـار ئەم دمـرن،
ژ بەر جەورێن چەرخا فـەلەک، ئێـدی ئەم بوونە گـێـژو لال...

ئەڤ ژیینێ دەربدەری مـرن سـەدجـار ژێ چێـتـرە،
ئەسـارەت و بەندەگـانی ملەتێ مـە کـر بێ مـەجـال...
هەکـە تو کـان بی ب ئاڤێ خـۆرتان ژ خـوەدێ ب پرس،
ب گلی و ب گـازنان ببـێـژ «ئێـدی بەسە ئەڤ حـال».

* رۆژنامەی: رۆژانوو، ژمارە: ١٨، ساڵی ١٩٤٣، ل٤ .

## ریا تازە*

ئەو پەردەیا رەش و تاری،
کو ژ شەڤێن رەش دیاری،
من.........
ژ روویێ خوە کشاند..
ل بەر چاڤێ خوە چراند..
ئو ئاڤێت......
ئاڤێت پاش سەد چیایی..
ناڤا هەزار دەریایی...
من، گەمارا گوهێ خوە، ب زەمزەمەکە نوە شوشت؛
ئو میکرۆبێن جانێ خوە، ب دەرمانەکی نوە کوشت...
***
ئەو زنگارا د مەژی،
کو مەژیی من دمژی
من......
ب کێرێ خەرتاند.
ئو ب ئاگر شەوتاند...
ئو پاقژ کر......
پاقژ کر ژێ سەرێ خوە
من ئاڤێت ژ دەرێ خوە
ب چاڤەکی بێ پەردە، ب گوهەکی بێ گەمار:

ددم سەر رێکە تازە، ب مەژیکی بێ زنگار...

***

ئەو کوفکا توفێلی
کو د دلدا دچێری،
من......
ژ کوکێ دە راکر...
هێلینا وێ خەرابکر...
ئو بەلاڤ کر...
ل رۆژێن دەرباس بوویی، ل راستییێن کەڤنارە؛
ل هەڤالێن نە هەمراه، جارا پاشین سەلاڤ کر.

***

من ئەو پەلێن رزیایی، ژ دەفتەرا خوە چراند،
درووپەلەکی نوو دە، ئایەتێن تازە چڤاند.

***

ئێدی.........
بدیتنا خوە،
ئو ب بهیستنا خوە...
ب ڤینا خوە ئو ب مەژی
ب رێڤەچوونا خوە ژی
ئەز بووم ئینسانەکی نوو، پرەستەشێ ئۆلەک نوو،
ئو د باژارێ دل دە من ئاڤاکر هۆلەک نوو...

شام: ١٩٤٢/٥/٢٥

* ئەم دەقە شیعرە، سێ جار بڵاوبۆتەوە، جارێکیان لە گۆڤاری (روناهی) ژمارە (٢٦) کە لە ساڵی (١٩٤٢) لەشام دەردەچوو، جاری دووەمیش لە رۆژنامەی (ئازادی) ژمارە (٥١) کە لە ساڵی (١٩٥٩) لە کەرکووک دەردەچوو، هەروەها جاری سێیەمیش لە پەرتووکەکەی قەناتی کوردۆ بەناوی (تاریخا ئەدەبیاتا کوردی) بڵاوبۆتەوە، (قەناتی کوردۆ) ئەم شیعرەی بەدەست نووسی لە قەدری جان وەرگرتووە کە لە پەرتووکەکەیدا ئاماژەی پێ کردووە. هەندێ جیاوازیش لەم سێ دەقەیە بەدی دەکرێت لە رووی رێنووس و پاش و پێش کردنی کۆپلەکان، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە لە دەقەکەی پەرتووکەکەی (قەناتی کوردۆ)ئاماژە بەوەدەکات کە دەقەکە لە ساڵی (١٩٣٩) نووسراوە، کەچی لەدەقەکەی گۆڤاری روناهی رۆژی (١٩٤٢/٥/٢٥)ی بۆ دانراوەو واتە لەم رێکەوتە نووسراوە، دوو دێڕیش زیاتر؛ دوو دێڕەکەش ئەمانەن:

من ئەو پەلێن رزیایی، ژ دەفتەرا خوە چراند،
د رووپەلەکی نوودە، ئایەتێن تازە چڤاند

# بەگێ ئاخر زەمان

دۆستێ من
دژمنێ پۆستێ من......
بەگێ ئاخر زەمان ......
ئەو زەمبیلا تو پێ هاتی
نەما داتێ ژ ئاسمان
بەنێ وێ رزیا ،
ل ناڤا رێ قەتیا
ئو... کەت
کەتە ناڤ دەریا سۆر
دەریا سۆر ژ ێ را بوو گۆڕ
دەریا سۆر
ژ فیرعەون و چەند خودێ بچووک را
بوو کەفەن .........
***
مووساو مریدێن وی
هەمی

بێ پرو بێ گەمی
ژ وێ دەریایێ دەرباس بوون
ژ جەورو جەفایێ خەلاس بوون
فیرعەون ل ور فەتسی
مووسا ل سەر رەقسی
نە مروودێ بچووک
مە ب ئاگر د ترسینە
پڤ مەشکا ڤالا
ئەی کەڤنارەیێ سالا
باوەریا دلێ مە
تاقەتا ملێ مە
ژ ئیمانا ئیبراهیم پێترە،
نەکێمترە.....
ڤییا بزان
ئەی پێغەمبەرێ دزان
دۆستێ من
دژمنێ پۆستێ من
بەگێ ئاخر زەمان
ئەو زەمبیلا تو پێ هاتی
نەما داتێ ژ ئاسمان
***
مەزناتی
نە ب پارەو مالە

نه ب گۆڕینا کاله
مەزناتی
ب جەوهەرێ ئینسانه
ب عیلم و عیرفانه
بەلێ... ئەم خەزانی مالن
لێ زەنگینێ کەمالن
زەنگینێ ئیدیالن
دۆستێ من
دژمنێ پۆستێ من
بەگێ ئاخرزەمان
ئەو زەمبیلاتو پێ هاتی
نەما داتێ ژ ئاسمان
***
کۆشکا تە یە هیم ڤالا
یا ب نینۆکا پالا
ئێن ب خوین
ئێن برین
گەلەک رەبەن ژ برچینا کوشت
تە ئاڤاکر د بن دا روونشت
ئەوێ ل سەر سەرێ تە هەلوەشە
گەرچی دلێ مە ب تە نا ئێشە
لێ ئەم دخازن
ب دل دبازن

زارۆیێن ته ئی بێ گونەهـ
کو ب هێژمار هەنە نەهـ دەهـ
ژ وێ تالووکێ خەلاس بکەن
ب رێیا راست دا دەرباس بکەن
رێیا راست، رێیامه
ئەوە باوەریا مە
زنجیر شکاندن
ئارمانج گهاندن
***
بابلیسکا بیستان
دیرۆکا راستان
دبێژە
ببێژە:
گوهـ مەدە ئەفسانەیێ دێوان،
ب شووندا نەمینە ژ کاروان
کاروانێ مەدەنیەت
گرۆهێ بەشەریەت
خولاسە
پێشیی و پاشیيا فەلسەفە
فەلسەفە یا مە
ئەڤە:
دین، مەزهەب.. ئیمان
ببە ئینسان، ببە ئینسان

***

دۆستێ من

دژمنێ پۆستێ من

بەگێ ئاخرزەمان

ئەو زەمبیلا تو پێ هاتی

نەما داتێ ژ ئاسمان

١٩٤٢ شام

* گۆڤاری روناهی، ژمارە: ٥-٦ سالّی ١٩٦١، ل ٣٣-٣٤

# کاروانێ مه

ئەم هیچ نەوەستیاین و ناوەستین
ل سەر ڤێ رێیا دوور
سەر ڤێ رێیا دژوار
ئەم دچن... و ئەمێ بچن.
بەر ب ئارمانجا خوە...
***
سەر دەریایێ بخوین
ژ چیایێن دار و دەڤی
دەشتێن بکەلەم و هستری
نەوالێن تەنگ و تاری
ئەم دەربازبووین
***
ل بن باران
لسەر بەرفان
با ...... و باگەر
ل شکەفتان
دبن دلۆپان
ب لنگێ خاس
ب جانێ تازی

کاروانێ مەدچە
بەر ب ئارمانجا خوە
***
ب کوڤیان رە پەنچە پەنجە
ب دێوان رە روو ب روو
مە جەنگ کر
وان ئەم کوشتین
مە ئەو کوشتن
ئەم نەترسیاین
نەبەزییاین
کاروانێ مە دچە
بەر ب ئارمانجا خوە
***
ئەم گەهیشتن چیایێ قاف
نێزیک بوو.. نێزیک بوو ئارمانج
خویاکر خویاکر بەهشتا کرمانج
ئاە......
ئەو نەخوش گیان
ئەو کولکێن ژ کاروان
بشوون دا مان
ئەو رەبەنێن بێ چار
مان... ژ بەهشتا مە بێ پار
***

شام ١٩٥٩/٩/٢٨

* ئەم پارچە هەڵبەستە دووجار بڵاوبۆتەوە، جارێکیان لە گۆڤاری (روناهی) ژمارە (١) کە لە ساڵی (١٩٦٠) لە بەغداد دەردەچوو، جاری دووەمیش لە رۆژنامەی ئازادی ژمارە (٢٧) کە لە ساڵی (١٩٥٩)لە کەرکووک دەردەچوو، لەم دوو دەقەیە هەندێ جیاوازی تێدا بەدی دەکرێت بە تایبەتی لە رووی رێنووسەوە، تەنیا یەک وشە لە نێوانیاندا جیاوازی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لە رۆژنامەی (ئازادی) دا نووسراوە (بەزیبیان) کەچی لە گۆڤاری (روناهی)دا نووسراوە (بزدیاین).

## سەرداریّ کوردان ... بارزانی

بارزانی... بارزانی..
د جەنگا وەلات دە،
د مەیدانا خەبات دە،
پەهلەوان....
قەهرەمان....
تویی،
بوویی،
هیمیّ کوردستان..
تە، هیمیّ کوردستان،
چیّتر،
پیّتر،
ل جی دانی
بارزانی... بارزانی..
***
بارزانی... بارزانی..
کی
ڤی
ناڤی
نزانی؟
هەرکەسی دیت،

هەرکەسی بهیست
ل رۆژهلات...
رۆژهلاتا ناڤین...
زڤستان و هاڤین..
کی دکە جەنگ؟ کی دکە خەبات؟
ل هەمبەری چەند دەولەتان،
ئەو دژمنێ ملەتان،
چەند دەولەتێن ئیستعمار،
کی بوویە کەلەم؟ کی بوویە بار
بارزانی... بارزانی
***
عەسکەرێن نوری سەعید،
کو دگەل جورجان خەلیت
دخەبتن...
دپەرپتن...
نکارن ڤی مێری،
ڤی شێری،
بخن داڤێ...
***
لەشکەرێن تورک و ئیران
بالافرێن ترومان
هیچ تو هاڤل نەکرن...
تشتەک حاسل نەکرن...
دیسا ل سەر چیان،
دیسان ل ناڤ مەیدان

دەنگ دکە،
جەنگ دکە،
بارزانی... بارزانی...
***
ئوردۆ، ئوردۆ شکاندن،
هەزار چەپەر قەتاندن،
مینا بروسک و ئەوران،
ل هەر جی.. ل هەر دەران..
دچرسە ددە دەنگ،
مینا داوەت دچە جەنگ
سینۆراز دچرینە،
ئوردیان ددرینە...
گاڤا ژێ رە بوو مەراق،
بێ پەروا داژو عیراق،
ددەسەر دلێ تورکان..
دچە باکوورێ کوردان...
دبە تیر.. دبە کەڤان...
خوە درێژ دکە ئیران...
ئەو عەجەمێن ئەسرار کێش..
ئەفیۆن کێش..
ب قەلوونا خوە دگرن،
دکەڤن تایا مرن..
ودبێژن:
دیسا کرنە خوبایی،
هات روحستین: بارزانی!

***

ئەی برادەرێ عەجەم

إخوان عرب الأشم

ئەی دیموکرات تورک قارداش

برادەر، ئیخوان، یولداش

ئەم هەڤال و جیرانن

دژمنێ ئەمریکانن

ئینگلیزن، ئینگلیز...

زنهار ژ وان مە بن لیز.

سەرداری مە، بارزانی

گەرەک هەر کەس بزانی

سەرداری ئازادی یە...

ناڤداری ئابادی یە...

رابن هوون ژی بلڤن،

ل دۆرا وی بجڤن...

بێژن... بژی بارزانی...

خەلاسکاری ئینسانی!

١٩٤٧ شام

* ئەم شیعر لە کتابەکەی رێزدار مسعود بارزانی (البارزاني والحركة التحررية الكردية) وەرگیراوە.

# شێرێ وەلات بارزانی هات

مزگین.. مزگین.. گەلی کوردان!
رۆژا کوردستانێ هەلات..
بارزانی هاتە نیشتمان،
شێر هات وەلات.. شێر هات وەلات..
مزگین ل وە، بارزانی هات
***
چیایی زاگرۆس بێ دەنگ مابوو،
باغچەو باغ بێ رەنگ مابوو،
ئەو مەیدانان بێ جەنگ مابوو،
رۆژا کوردستانێ هەلات..
شێر هات وەلات... شێر هات وەلات..
مزگین ل وە، بارزانی هات..
***
شوونا شێران مابوو ڤالا،
شین گرتبوون خۆرت و کالا،
پەپووک مابوون، ژن ل مالا،
رۆژا کوردستانێ هەلات..
شێر هات وەلات.. شێر هات وەلات..
مزگین ل وە، بارزانی هات..

***

نەخویا بوو، ژ چەند سالان،

ژ بۆنا دەردێ نیشتمان،

چوو بوو دگەریا، ل دەرمان

رۆژا کوردستانێ هەلات..

شێر هات وەلات.. شێر هات وەلات..

مزگین ل وە، بارزانی هات..

***

ژ بۆ شەڤێن رەش و تاری..

دەستە.. دەستە.. نوور ئار ئانی،

ئەو مەرهەما سەر دلانی..

رۆژا کوردستانێ هەلات..

شێر هات وەلات.. شێر هات وەلات..

مزگین ل وە، بارزانی هات..

***

ل ناڤ باغان رەیحان و گول

ل سەر شاخان... شالوول، بولبول

ب کەن. ب خوین.. غەم چوو ژ دل،

رۆژا کوردستانێ هەلات..

شێر هات وەلات.. شێر هات وەلات

مزگین ل وە، بارزانی هات..

***

مژدە ژ بۆ دارو بەران

دەشت و نەوال ل هەر دەران
ل سەر دلان.. ل سەر سەران
رۆژا کوردستانێ هەلات..
شێر هات وەلات.. شێر هات وەلات..
مزگین ل وە، بارزانی هات..
***
ل عراقێ، کورد و عەرەب،
ئازاد بوونە ژ نیرێ غەرب..
ل سەر یەک رێ.. ل سەر یەک دەرب
رۆژا کوردستانێ هەلات..
شێر هات وەلات.. شێر هات وەلات..
مزگین ل وە، بارزانی هات.
***
ئازاد بوویە سلێمانی
سبە دۆرا مۆش و وانی
مەهابادو سنەو بانی!
رۆژا کوردستانێ هەلات..
شێر هات وەلات.. شێر هات وەلات..
مزگین ل وە، بارزانی هات..
***
بژی ئازادی و کوردستان
بژی ئاسایش ل جهان
بژی ئینسان برای ئینسان،

رۆژا کوردستانێ هەلات..
شێر هات وەلات.. شێر هات وەلات..
مزگین ل وە، بارزانی هات..
بارزانی هات.. بارزانی هات..

* گۆڤاری: هیوا، ژمارە: ٤، ساڵی (١٩٥٨)، ل٧٦-٧٧ .

## شێرهات وەلات

شێرهات وەلات
شێرهات وەلات
رۆژا کوردستانێ هەلات
مزگین ل وە بەرزانی هات
***
چیایێ زاگرۆس بێ دەنگ مابوو
باخچە و باخ بێ رەنگ مابوو
ئەو نەوالان بێ جەنگ مابوو
شێرهات وەلات
شێرهات وەلات
رۆژا کوردستانێ هەلات
مزگین ل وە بەرزانی هات
***
مزگین ل وان دەر و بەران
رەیحان و گول و سونبلان
ل سەر چیان... ب سەر دلان
رۆژا کوردستانێ هەلات
مزگین ل وە بەرزانی هات
***
ئازاد بوویە سولەیمانی

سبه دۆرا مووش و وانی
مەهاباد و سنه و بانی
رۆژا کوردستانێ هەلات
مزگین ل وە بەرزانی هات
***
رووچکێ خوە رەش کرن
دلێ مه ژی ئێشاندن
ژ مەمکێ دیا خوە
خەنجەرا خوە کشاندن
***
ژ مەیدانا هیممەتێ
مینا رۆڤی رەڤیان
ب چەکێن دژمنێن خوە
خوینا برا رژاندن
***
شۆرەش ب وان نه خورت بوو
ب چوونا وان قەلس نه بوو
لێ ب ڤێ دو بەندیێ
دژمن ب مه کەناندن
***
ئیرۆ بوونه شوومشوومۆک
پف دکن رۆنیا رۆژێ
مالا خوە کامباخ کرن

چرا خوه ڤەمراندن

***

ل دیرۆکا وەلات دا
ناڤ نیشانێ وان هەبوو
ژ شۆڕەشا کوردستان
رووپەلێ خوه چراندن

***

هەر بژی شۆڕەشامە
شۆڕەشا مە یێ بژی
بەرزانی و پێشمەرگە
هێڤیا نوه ڤەژیاندن.

* ئەم پارچە شیعرە لە هەندێ کۆپلەدا لەگەڵ پارچە شیعرەکەی (شێرهات وەلات بارزانی هات) یەکتر دەگرێتەوە، بەتایبەتی لەو چوار کۆپلانەی سەرەوەدا، جگە لەمەش ناونیشانیشیان زۆر لێک نزیکن.

* دلاوەرێ زەنگی، نڤیسکارێ کورد قەدری جان، (دەستنووس).

# وەختی نیە

نیشتمان بریندارە
وەختی ئەفسانە نیە.
لەبەر چاوان سەدارە
وەختی بێگانە نیە.
ئەی جەنابی «پیرەمێرد»
ساڵ دیدەی گەرم و سەرد
بۆچی تو پڕ ئەکەی دەرد؟
وەختی «مەی خانە» نیە.
ئەی کچە لە «چەم چەماڵ»
«کچە کورد» کچە دەلال
لە حەد زیادە تۆ مەناڵ
وەختی گریانە نیە
ئەی «نالی»ی دیوانی
بۆ ماچێک شەیدانی
تۆ خۆت ئەکەی هەرزانی
وەختی «قوربانە» نیە

نیشتمان بریندارە
لەبەر چاوان سەدارە
وەختی عەشقانە نیە
وەختی مەستانە نیە.

* گ: گەلاوێژ: ژمارە: (٩-١٠)، ساڵی ١٩٤٧، ل٣٥-٣٦ .

# شینا پێشەوایی مەزن قازی محەمەد

ئەفسووس!... ئەفسووس!
چ دەردەکی گرانە!
برینەک، بێ دەرمانە!
ژ دل نالین...
ژ دەڤ کالین...
هەزار ئاه، هەزار زارین
ژ چاڤێن مە هێسترێن خوین،
تێنە جۆش.. تێنە خرۆش..
***
د بێژن کو ئەو عەجەمێن ئەفیۆن کێش
ئەسرارکێش
ب دەستێن خوەییێن گەماری
دانین سێپیا خوین خواری
سەرێ پێشەوا دانە پێش!
ئەو رێبەرێ بێ هەمتا ،
تەڤا چەند وەزیرێن وی،
کشاندنە بن سێپیا!
ژ ئەردێ بلند کرن!
د دەڤێ وان دە قەلوون

د سەرێ وان دە ئەفیۆن
لنگێ شێران کل کرن!
کارێ وانە ژ ئەزەل، بێ وەفایی،
بێبەختی و خوینخواری و جەفایی،
***
تو هیچ خێرێ نەبینی، ئەی ژونپۆلێ ئنگلیز...
ژ وان ئەسرار کێشان رە،
تەحازر کر ئەڤ لیز...
رۆیێ تە رەش
ئەی تەرەس
ئەی بێ نامۆس ترۆمان
بالافرێن تەبوون بەس،
ئەزربەیجان، کوردستان...
تەڤا زارۆ زیچێن وان
کرنە بومبار دۆمان...
***
بشارێ خوە کرنە ئینگلیز، ئەمریکان،
ئەسرارکێشێن عەجەمان و تۆرانیێن تورکان
ئەو دکارن مە بکوژن،
تۆپ و تانگێ وان هەنە
زارۆ زیچان قڕ بکن
بالافرێن وان هەنە...

لێ بەرا بزانن
کو چقاس کوردان بکوژن
کوردێتی ئەوێ بژی
گەر بمینە مێر و ژن
بێ گومان رۆژا مە ژی
ئەوێ بێ رۆژا راستی
د دیرۆکا بەشەردە،
خوبابە هەق پەرستی
***
ئەی پێشەوایێ ناڤدار
دوژمن ئەگەر توکوشتن
ناڤێ تە یێ پڕ شیرین،
هەتانی ئەبەد هشتن
هەر جارا کو لنگێ وە
سەرسەرێ وان کل دبوو
گیانێ وە بلندتر،
بەر بە ئەزمان هل دبوو
ئەم دزانن...
هوون نە ئەو کەسن کو هیچ بترسن
ل سێپایێ دوژمنان
پەروابکن، بپرسن
چقاس وە حەنەکێ خوە
ب سێپایێ وان کرن

بومبا وی یا ئەتۆمیک
ژ گەرمییا دلێ مە
نکارە هیچ سار بکە،
ناتەوینە ملێ مە،
ئەی شەهیدێن ئەبەدی،
ئوغرا وە یاخێرێ بە
سەلامێ مە ل وان کن،
هەرکی رێوییێن ڤێ رێ نە
ناڤێ وە، ئەوێ بژی...
ئەوێ کوردستان بژی
گیانێ وە،
د دیرۆک و داستانان ڤەژی.

١٩٤٨ شام
* رۆژنامەی العراق: ژمارە (٢٨٢٠) ساڵی ١٩٨٥ .

## هەیڤا سۆر[١]

هەیڤا سۆر،
نیشانا ئاشتی یە
هەلبوو ژور،
مزگینا دۆستانی یە...
گەهیشتە ناڤ هەیڤ و ستێرێن ئاسمانان
دەرکەت... وان ڤە خوینە،
دەعوەتا ئاشتی و دۆستانی
ب کەیف خوشی
ب دلگەشی
ب وان رە گوڤەند بکە
ل ئاسمانان
***
براسێوییێن هیرۆشیما
و ژنەبییێن ناکازاکی
... نەترسن
هەیڤا سۆر،
نەبۆمبا ئوتۆمیکە
وەک گولێکە سۆر
هەلبوو ژۆر.
بینا دۆستانی ددە دۆر

***

هەیڤا سۆر،
یا گەهیشتە ئاسمانان
و زیڤر، زیڤر ل دەورا دنێ دگەرە،
کەسی ناترسینە،
کەسی نائێشینە،
ب دلپاکی ژ مە را
سلاڤا دشینە-
د کاری بوو هوندرێ خوە تژی بۆمبا بکە
و خوە بدە واشنتۆن
و لوندرێ،
مینا هیرۆشیماو ناکازاکی
کامباخ بکە... کەڤر ل سەرکەڤر نەهێلە
وان سەرێن جەنگخواز بچقینە،
کوردێن رەبەن،
عەرەبێن فەقیر،
کوردێن بندەست
ژ بەلا وان ئازاد بکە...
لێ، ل ور، ئینسانێن بێ گوناه
کو ب ملیۆن هەنە، نە دە
ئینسانێن بێ گوناه هەنە، حەیفن
هەیڤا سۆر... نەخوینخوارە،
ژ بۆ ئاڤا کرنێ هاتیە چێکرن

نیشانا ئاشتی یه
مزگینا دۆستانی یه
بژی هەیڤا سۆر!
بلند به،
گولا سۆر...

شام ١٩/١٠/١٩٥٧

*: روژنامەی ئازادی، ژمارە: ٣٠، ساڵی ١٩٥٩ .

(١) هەیڤا سۆر: یانی مانگی سۆر، مەبەست لەمانگی دەستکردی یەکەمینی سۆڤیەتە.

# چاردەی گەلاوێژ

گەلاوێژ،
شەڤێن تاری چڕاند..
پەردەییێن رەش دڕاند..
چاردەی گەلاوێژ
ئەی چەژنا پیرۆز...
مرنا خوینمژ،
مارێ ئاڤادۆز...
***
مارێ ئاڤادۆز،
تەڤری...
لەرزی..
ل ئاخا عیراق...
عەچقی،
پەچقی،
دبن لنگێ کورد و عەرەب،
ئەو پەیمانا بەغا
ئەو پیسە میساق...
ئەو پەیمان!

ئەو فەرمان!
ئەو ژارا مار،
ئەو درانێ سەهی هار،
ژ لەندەن...
دیاری هاتە شاندن...
ژ بۆ نۆکەرێن کەڤجال
تەڤا چەند دەرهەمێ مال
***
بۆ کوشتنا ئازادیخواز
کوشتنا عەرەب و کوردێن بەلەنگاز
ژ لەندەن...
دیاری هاتە شاندن...
ئەو پەیمانا خوینخوار،
ئەو فەرمان و ئەو سەدار
ژ لەندەن...
بەلێ...
ئەرێ...
ژ لەندەن...
دیاری هاتە شاندن...
***
ئەو فەرمان و ئەو سەدار،
سەرێن نۆکەرێ خوە، خوار...
ئەو پەیمان و ئەو فەرمان

ژ ملەت رە بوو دەرمان...
عەرەب و کورد زێدە تر،
ژ بەرێ پێتر.. پێتر،
ل نیشتمان،
ب رزگاری،
هەڤال و برادەر مان...
***
جەمهوریەتا عیراق،
ئەی ... ستێرا پڕ رۆناک
جەمهوریەتا عیراق...
وەلات ب تە رۆناهی...
شەوقا تە دا هەر ئالی...
ل ژۆر... ل ژێر... راست و چەپ
فارس... تورک... کورد و عەرەب
ب ڤێ رۆژێ کەیف خوەشن..
ب ڤێ جەژنێ سەرخوەشن..
هەرکەسێن ئازادیخواز،
ژ تە رە دکەن نیاز،
ئەی قاهرێ نۆکەران،
خودی یێن گورزێ گران،
قەهرەمان (عبدالکریم)!
ئافەرین سەد ئافەرین...
***

بژی سەدارێ عیراق،
تەڤا هەڤالێن دلپاک...
وە خلاس کر نیشتمان،
بەغدا... هنەک کوردستان.
پێشڤە... پێشڤە. هەر پێشڤە...
رۆژهەلات گش ژ مێژڤە،
ل بەندە ڤێ رۆژێ بوون،
داخوازێ ڤێ دۆزی بوون:
ئازادی و براتی
ئاسایش و ئاشیتی...
ل ناڤ حەموو وەلاتان،
ل هەرجێ و جیهاتان...
دۆستانێک بێ گومان،
ل ناڤ ملەتێ جیهان..
ببە قانوون و دەستوور
ل ناڤ گەلێ گروهوور
ب دل ب جان و گیان
ئینسان... برایی ئینسان
ئینسان... برایی ئینسان.

١٥ گەلاوێژ ١٩٥٨ شام

* گۆڤاری: هیوا، ژمارە: ٣، ساڵی ١٩٥٨، ل٤٩-٥٠ .

# شینا جەلادەت بەدرخان

میرێ کورد
لاوێ کوردستان
نەڤیێ بەدرخان
جەلادەت،
فیداکار خوەدیێ هیمەت
جەندەکێ وی کر دڤر دە بن ئاخ بوو
گیانێ وی بلندی ئاسمان بوو...
دربیا نیشتمان
خوەدیێ ب جان
گیانێ خوە کر قوربان
نەمرییە، زندییە...
ناڤێ وی ئەبەدی یە...

# نامە
# بۆ ئێستگەهێ رادیۆ تاران

زنهار...
ئێستگەهێ رادیۆ تاران
برادەرێ کورد زمان!
دەنگێ دیل و ئەسیر!
دەستێ ب قەید و زنجیر!
زنهار...
مەکە هاوار
ژ بۆ کوردێن عیراق:
کوردێن ئازاد،
لازم نیە فیغان و فریاد
**
ل عیراق،
کوردو عەرەب
ب دەست و لەپ،
چراندن حەموو پەیمان و میساق
میساقێن ئیستیعماری
ب سەربەستی و رزگاری

ل نیشتمانێ پیرۆز
بێ نۆکەرو ئاڤادۆز
دژین...
بێ ئاه... و ... بێ ئەنین...
زنهار...
مەکە هاوار
ژ بۆ کوردێن عیراق:
کوردێن ئازاد،
لازم نیە فیغان و فریاد
ئێستگەهێ رادیۆ تاران...
برادەرێ کورد زمان!
دەنگێ دیل و ئەسیر!
دەستێ ب قەید و زنجیر!
زنهار...
مەکە هاوار
ژ بۆ کوردێن عیراق:
کوردێن ئازاد،
لازم نیە فیغان و فریاد
**
بگری... بکە هاوار...
بۆ پێشەوای ل بن سێدار
مەگری بۆ کەسێ ئازاد
بگری بۆ، مەهاباد

بگری بۆ پایتەختێ تارو مار
بگری بۆ ئەو پارچە: نیشتمانێ بریندار
فرمێسکی سەختە
لەچاوی خەستە
مەرەشتە،
ئێستگەهێ کوستاخ
دەنگێ بومێ کامباخ
زنهار...
مەکە هاوار
ژ بو کوردێن عیراق:
کوردێن ئازاد،
لازم نیە فیغان و فریاد
**
ل عیراقی شۆڕەش،
روویێ نۆکەرێن جیهان کرە رەش
کوردو عەرەب ب براتی
ل سەر رێیا ئاشتی
بەیەک دل و بەیەکجان
ئازاد کرد نیشتمان
زنهار...
مەکە هاوار...
ژ بۆ کوردێن عیراق:
کوردێن ئازاد،

لازم نیە فیغان و فریاد
**
ئەی شاهپەرست
هستو بەنێر... زنجیر لە دەست!
برادەرێ کورد زمان
بگری... بۆ نەخوشێ بێ دەرمان
بگری... و بنال...
بۆ ژ نەبی و منال...
بۆ سیویێ بێ باڤ و مال
بگری بۆ کەسێ زگبرچی
بگری بۆ کەسێ پشت بەقامچی
بگری بۆ کەسێ چاڤ بەفرمێسک
دل بە ئاه...
**
ئەی تەرجمانێ شاهنشاه
بگری بۆ وان و بتلیس
مەگری بۆ شەیتان و ئیبلیس
زنهار...
ئێستگەهێ رادیۆ تاران
برادەرێ کورد زمان
دەنگێ دیل و ئەسیر
دەستێ ب قەید و زنجیر
زنهار...

مەکە هاوار،
ژ بۆ کوردێن عیراق
کوردێن ئازاد
لازم نیە فیغان و فریاد
**

* رۆژنامەی: ئازادی، ژمارە ٤٦، ١٩٥٩، ل٣ .

# گولا سۆر

گولا سۆر
هلبوو ژۆر،
بین دا دۆر،
گولا سۆر......
گولا سۆر
ل پاش چیاییَ قاف شین بوو،
عالەم ژیَ را ئەڤین بوو،
گولا سۆر،
ب مە خوەش،
دا مە هەش،
ئەم ب بینا ویَ سەرمەست،
ئەمیَ پیَ شا بن سەربەست.
نازەنین......
خەمرەڤین،
خەملین،
پیَ زەمین،
گولەکە بیَ کەلەمە،
د ناڤ باغیَ ئیرەمە.
گولا سۆر،

ئەم ل دۆر
بجڤن،
بین بکن
دۆر ب دۆر.

۱۹٤،

* پ. قەناتی کوردۆ، تاریخا ئەدەبیاتا کوردی، بەرگێ ئێکی ستۆکهۆڵم ۱۹۸۳ . (لاتینی)

# ئەز دچم مۆسکۆ

ب ئاگرێ دلێ زاهیدەکی دچە حەجا...
ب هەوەسا ئەڤینداریێ بەر ب دەلالا خوە دچە،
ب ئارزوویا زارۆکی را دپەلکە دیبیا خوە دکە،
ئەز دچم مۆسکۆ......
دەڤێ من، دلێ من هەر زەرەییێ لاشێ من دکەڤە،
هەر سێ زارۆکێن من ل دۆرا من دچڤن،
ژ من دیارییا مۆسکۆ دخوەزن.
****
سوارێ کەشتیێ بووم،
تەڤا پێنسەد هەڤالی،
هەر یەک ژ وان ژ من بێتر ب هەیەجان،
هنەک ژ وان عەرەبن،
هنەک ژی چەرکەس، کوردو ئەرمەنن......
لێ هەموو یەک زمان و یەک دلن،
زمانێ دۆستانی، ئاشیتی......
وەکە برا دچن مۆسکۆ...

ستران، گۆڤەندو دیلان،
ژ جوش و خوروشا وان را،
پێل و ماسییێن دەریایێ منێکار،
ب ڤی ئاهەنگی ئەم گیهیشتن دەردەنێل،
پاشێ ئیستەمبول،
دیبارو باژارێ نازم حکمەت،
نازم حکمەتێ زارۆک د وێ دەرگۆشی دا
هاتە هەژاندن......
دیبا وی ئا موهریبان ل ور،
ژ نازمێ زارۆک را لۆریبا ئازادییێ دلوراند،
دەنگێ نازم حکمەتێ مەزن ل ور،
ل همبەر ئیستبدادێ کرە گورمین...
لێ ئیرۆ ئەڤ دیبار حەزینە،
ژ دۆرکەتنا کورێ خوەیێ فەداکار، وەفاکار...
ئو دنالە...
د بن لنگێن ئەمەریکان و نیشتمان فرۆشان
****
ئەم گیهیشتن «ئۆدەسا»!
مەحشەرا براتی...
گرۆه- گرۆه خەلک، ژن، مێر، پیرو زارۆ
ل بەندێ مە بوون،
مینا کەرییێ بەرخ و مییان
ئەم ل سەر هەڤ کەلیان،

مە هەڤدو هەمێز دکر،
مە هەڤدو ماچ دکر،
ژ چاڤان هێسترێن کێفخوەشی و دلگەشی،
د هەرکێن سەر روویان....
دەنگێ «بژی ئاشیتی و دۆستانی»
دچوو ئەزمانان...
ئەڤ حال ل سەر رێ، ل هەر بازاری،
هەتا مۆسکۆ ووسان بوو....
د ناڤ وەلاتەکی بوهوشتێن،
ئینسانێ وەک مەلەکان...
دل ساف....
دەڤ ب کەن... روو ب کەنێن....
نزانم چاوان دەستێن نازیێن ئەحماق
ل ڤان دگەربیا....
خۆش، پاشێ دەستێ وان ژی....
لنگێ وان ژی هاتە کشاندن، یا
موجزێ ژی ئەڤە...
گاڤا دژمن دەستێ خوە
درێژی ڤی وەلاتی دکن،
بەرخێ ڤی وەلاتی دبن شێر،
****
ئەز گیهیشتم مۆسکۆ....
ب گەرمیبا دلێ زاهدە گیهیشتە حەجێ،

ب هەوەسا ئەڤینداره گیهیشته
هەمبەزا دێلا خوه....
ب هەیەجانا زارۆکی را د پەلکە مەمکێ دییا خوه،
ئەز گیهیشتم مۆسکۆ.......

مۆسکۆ ١٩٥٧/٧/٢٦

* پ. قەناتی کوردۆ، تاریخا ئەدەبیاتا کوردی، بەرگێ ئێکی ،ستۆکهۆلم، ١٩٨٣ . (لاتینی)

# جەژنا ئۆکتۆبەرێ

د وەلاتێ قــەیســەران، تام چەل و سێ ســال بەرێ
گــوور بوو ب دەســتێ لەنین شــۆڕەشــا ئۆکــتــۆبەرێ
مــینا پێلێ دەریایێ رێنجــبــەر، پالە، جــەفــاکــێش
د دەســتــان ئالا مــارکس، لەنینێ مــەزن ل پێش
ئاژۆتن ســــەر کـــەلە و بەدەنێ ژ هەزار ســـال
ب چاکــووچ و داســێن خــوە دەنگێ تۆپان کــرن لال
ئەو کــۆزکــێن ژ پۆلا ب دوو هەڤ هلوەشـــیـــان
سەر جەندەکێ خوین-مێژان گورۆهێ گەل مەشیان
ژ دەســـتێ زادەگـــانا گـــەلێ دیل گش ئازابوون
ب ڤێ جــەژنێ رێنجــبــەرێ جــیــهــانێ هەمی شــابوون
ب تیـــرێژا ئۆکـــتـــۆبەر گـــەلەک وەلات چرسین
ژ رۆژئاڤـــا، رۆژهەلات، هەتانی کـــۆریا و پەکین
د دۆژەها قــەیســەران ب راســتی چێــبــوو بوهوشت
هیڤ، ســتــێــرێ رەنگە-ســۆر ب ئەزمــان رە گــهــشت
د بابلیــسکا ئۆتۆم و د ڤــان ســالێ هێــڤــێن ســۆر
فــیــرعــەونەک ژ ناڤ مــوومــیــا سەرێ خوە راکــر ژ گــۆر
مــینا باڤ و کــالێ خــوە، وی ژی دا ســەر رێیــاخــوین
د ســینگا مــســرو ســۆریێ ڤــەکــر ســەد هەزار برین
ئازادیــخـــوازێ وەلات ئەڤ بوونە سێ زبســـتـــان

ئاڤــێــتــیــە زیندانێ فــیــرعــەونێ ئاخــرزەمــان
دەســتێ پاک کــەلەم چێکر، ســەرێ ئازا ب مــیــر کــر
ســەرەنجــامــا هیــتلەر و مــوســوولینی ژ بیــر کــر
ئەمێ ئیــــرۆ پیــــرۆزکن ژ ناڤ دیوارێ ســــتــــوور،
جــەژنا ئۆکــتــۆبەرا خــوە، خــەلاس نێــزیکە نەد وور.

زیندانا مەزێ ٧/١١/ ١٩٦٠

* دلاوەرێ زەنگی، نڤیسکارێ کورد قەدری جان، (دەستنووس).

## ل زیندانێ شۆڕەشا مە

ب دەنگەکێ مە زیندانا وە هەژاند
ب قیرینەک مە کەلا وە هەلوەشاند
هوونێ دەربێ مە ببینن جەلادنۆ!
ژ پاش هەسن مە هەیبەتا وە شکاند
***
د ناڤ پۆستێ شێران دە وەک رۆڤیان
زار و زێچێ مە بەزداند ڤان کۆڤیان
دگۆتن قەی ژ مەیدان مێر کشیان
دەستێ ب زنجیر ماسکە ژ روویێ وە کشان
***
مە بالا خوە ب وەر گەلەک درێژ کر
لێ رۆژ ب رۆژ وە دلێ خوە قرێژ کر
چەند دلۆپێن خەزەبێ سەر وە رێژ کر
گەشتا کەرامەتا وە، پێ خەسقاند
***
مە سەرما دی، دلێ مە هیچ سارنەبوو
د بن بارێ بەرمیلا، سەرخوار نەبوو
ئیشکەنجەیا ب شەڤ و رۆژ، کۆر نەبوو
ب ڤینا خوە، دەڤ و لێڤێ خوە چراند

***

بژی یەکیتیا شێرێ قەفەسان

هەڤالێ مە پەرواز دکن ل ئەزمان

ئەمن رۆناهیا تاریا جیهان

لێنینێ مە تۆڤێ ئاشیتییێ چاند.

زیندانا مەزێ ٥/٤/١٩٦١

* دلاوەرێ زەنگی، نڤیسکارێ کورد قەدری جان، (دەستنووس).

## بەردێلک

عوسمان سەبری
ژ قەدری جانێ جان برا ڕا

ژین خوەشە ب خورتی
ل کوردستان ب کوردان،
باڤ و بران؛ چ بکم؟
هەموو من تێ ب دەردان.
***
من دل تو جار نەنالی
من زار تو جار نەکالی
ب دل هشکی ب لالی
سینگا خوە دا بەر رمانی.
***
من ئیشەڤ دیت خەونا راست
دەنگ و گازی چ خوەش هات
دگۆت رابن کوردنۆ!!
تەڤ بران و تەڤ خوەهان.
***

دەربان ل مە تو زانی
رم نینە گش نەزانی
خۆپان کرن کوردانی
ئەڤ ترال و نەزانان.

***

هاوارێ، خوەش ئاواکر
دلێ کوردان پێ شا کر
زارو زمان ئاڤاکر
ژین و خوەشی بەلا کر

کانییا عەرەبان ١٨/٥/١٩٣٢
* گۆڤاری: هاوار: ژمارە: ٢، ١٩٣٢، ل١٠ .

# ژ قەدری جان رە*

«جگەرخوین»

ئەی هەڤالۆ دەلالۆ، تو هەرتشتی دزانی
دزمانێ مەکوردانی تو وەک مەلایێ خانی
تو خورتەکی چەلەنگی ئەز کالەکی زەمانی
دل و گەردەن شکەستی بەندەوارێ خزانی
خوەدێ تەخوەش بهێلە، تو خورتەکی جوانی

ئەرێ روویێ تە رۆژە، ئاڤادێ دا دیارا
دەڤێ تە وەک بشکوژە، نوو دەرکەڤی ژ ڤارا
پۆرێ سەرێ تە سۆرە، وەکە گولا زنارا
سەرێ تە کەهروبایە موو د ستینی ژ مارا
ئابینەیا ئەسکەندەر چاڤێ تەبوو ل دارا

برهێن تە پڕ زراڤن، هەر دوو وەکی دووهیڤا
پۆزێ تە ئی جلاکی، سادە ژ زێڕو زیڤا
بەژنا تەیا سیامەند، ل زۆزانێ سلیڤا
سوندێ دخۆم ب ئاتەش، ب وێ فرقێ کریڤا
ل بەر تاڤا ئەمانە زازو تورو بریفا...

دێرک چ خوەشە ب دارو ئاڤە

ئـەڤ ئـاڤـــــــــە ل هـەر، دەرێ بـەلاڤــــــــــە
یەک غــــابە، بەلێ، بهــــوشـــتـــە و مـــەئوا
پرمـــــشــــــمش و ســـــێڤ و دارو ســــــەلوا

پـڕ گـــــــــــووزو هـەژیـرو خـــــــــــۆخ و هـنـار
پـڕ کــــــــــانـی و ئـاش و ئـاڤ و جـــــــــــۆبـار
یـەک دی هـەیـە، پـێ دبـێـن کـــــــــولـێـــــــبـێ
گـــــۆری یە ژ وێ رە خــــــورسی و شــــــێـــــبێ.

پڕ ئـاڤــــــەکــــــە ســــــارو پاک و شـــــــرین
پـڕ دارو بـەرو گــــــــــــیــــــــــایـێـن رەنـگـین
بـــلـــبـــل دگـــــــــــــــــــــــری ب ئـــاه و زارە
داخــــــــــوازا وێ کـــــــــــۆمـــــــــــەلا هـەوارە.

مــــــــــزگـین ددێ ئـەو هـەڤـــــــــــال یـارە
قـــــــەدری کــــــــو ل شـــــــاهـێ خـــــــوندەوارە
چـەپـــکـــان دکـــــــــــــــــوتـــن دبـێـــن بـــرادۆ
گــــــــــــــــورێ تـەبـین خـــــــــــــوەه و بـــرادۆ

١- جگەرخوین، دیوانا یەکەم، پرسک و پێتی، چاپخانا باهۆز، شام، ١٩٤٥
* ئەم شیعرە بۆ یەکەم جار لە ژمارە (٥)ی گۆڤاری هاوار بلاوکراوەتەوە، هەروەک لە جێی خۆیدا ئاماژەمان پێ کرد، بەلام لە کاتی بەچاپگەیاندنی دیوانەکەی (پرسک و پێتی) کەتیا دابەزی، چەند کوپلەیەکی دی بۆ زیادکردووە، جگەلەمەش هەندێ دەستکاری لەهی پێشەوەی کردووە، واتە ئەو کوپلانەی کە بۆ یەکەم جار بلاوی کردبوونەوە.

# بەردێلک

ژ قەدرێ جانێ برارا

ئاخ وەلاتۆ ئاخ وەلاتۆ
زولما نەیار ژێرا هاتۆ
عەمرێ من چوو سی سال ددیت
من نەدیت رۆژ لێ هلاتۆ
باڤ و برێن خوە دپرسی
ئیرۆ خەبەر ژ وان هاتۆ

هن برینن هن کوشتی نە
ئەوێن دی ژی ل سەر شینە
ئەو خوەهێن شین گرێدان
ل سەر ئێگر روونشتینە

چاڤێن وان گی هێستر خوینن
تم دگرین ل خوە دخینن
دگرین و ل خوە دخینن
قەدری جان ژی پێ دخینن

ئەڤ خەبەرا ژ چ بەیان
ژگۆتنا یەکی جوان
ئەڤ جوانا فلتیە
ژ دەست نەیارێ کوردستان

ئەڤ جوانا پسمامێ تەیە
ئەو ژ خوین و دەما تەیە
ل سەر سەران ل سەر چاڤان
هاتە جەم مە مێڤانێ مەیە

بایێ ل تە کر بۆرە بۆر
ئەو نالینە.. تێیی ژ ژۆر
ئەو کاغەزا تە ئا ب خوین
یانی ئێدن هات سەر مە دۆر
قەت مەترسە خوەدێ کەریمە
یامە دڤێ: ئیرۆ هیمە
رەنج و تەنگی مەپڕکشاند
یەزدان غەفوورو رەحیمە

سازێ تە گەر نە درێژە
لێ ژ چاڤان خوین درێژە
ژ رەنج و زولما نەیاران
ئەم بوون بێهۆش کەرو گێژە

قەدری برا ئەڤ چ حالە
نە هۆگرمان نەهەڤالە
شینا ئیرۆ پڕ ل جی یە
هەتا قامەتێ «ل» بالە

«لاوی فندی»

* گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ٢٢، ساڵی، ١٩٣٣، ل٩ .

# جوهابا دایکێ

نووخوریێ خوه قەدری جان رە.

قەدری، قەدری، جانێ من
کوڕکێ من چاڤێ من
نڤیسارا تە گها
خوەش مەقام و پڕ بها
هەرێ زیزە ب کولە
خوەش بهنە ئەو سۆرگولە
هەم دەنگە هەم لاژەیە
خوەش کەلامە بێژەیە
سلاڤە هەم پەرگی یە
پەیامەک ژ رێوی یە
بەرخکێ من دکالی
ل ماکا خوە د نالی
ژ دایکێ دوورکەتی
نالینا تە کوور کەتی
بەلێ نووزا نەوزاری
لێ دکەڤی تەرادی
شەهلەوەندی سواری
خۆرتێ منی ل کاری

هەر چەند دووری وچوویی
نووخوریێ من لێ تویی
ناچت ژ بیر نووخوری
ب کورێن دن و نەڤی.
دلێ خوە هەر خوەش بکە
بهنوونا خوە گەش بکە
ژ پاشلا دێ دەرکەتی
ناڤ براکێن خوە تو کەتی
تو کەتی ناڤ برازان
عەشیرەکە پۆز بەران
ئێلەکە ئەڤ گەلەک کەڤن
خودان رێزک خودان تەڤن
ل سرووجێ سەرحەدان
پەیدا دبن ل ئیران
خوەش جڤاتن د مەکشن
د شەرِی دە شوورکێشن
برازی نە برازن
وەک خەزالان د بەزن
عەشیرەکە سینگ ب پرچ
کو مەزن بوون دبن «هرچ»
سپەهی، چەلەنگ و «بۆز»ن
هەنی بلند ب پۆزن
هن پرسێن وان ببەهین

خوەش مەقامە مەم و زین
فەرهەنگا خوە بکە پڕ
لێ مە بێژە «یازمیش کر»
«گۆروشموش بوون» ژی هەبە
تو ئەڤاها قەت مەبە
هێشتر دبێن دەڤە هەرە
ئەڤ پرسەکە کەڤنارە
کوردمانجیەکە خوە رووە
شوکرێ مەکە گەزۆیە
ب خاترێ تەکورێ من
ب تە ڤەیە دلێ من.

-هاوار-

* گۆڤاری: هاوار، ژمارە: ١٨، سالّی، ١٩٣٣، ل٣ .

# جەندەکێ د ڤێ گوڕی دا

جـــــــــەنـدەکـێ د ڤـێ گـــــــــوڕی دا
زۆر نـــازک و جـــــــــــــــــوانــە
ژ دێـرکـــــــا چیـــــــایـێ مـــــــازی
نـاڤـێ وی قـــــــــەدری جــــــــانـە
هـەزار خـــــــــوەسـی ل گـــــــــوڕا وی
هــۆزانــەکـی کــــــــــــــــوردانــە
وەلاتـپـــــــــارێـزەکی قـــــــــەنج بـوو
رۆهـســــــــتـین ژێ گــــــرتی جـــــانـە
گـــــــۆرێ خـــــســــــتـــــــە زکی خـــــوە
ئـەو ژی کـــــــــــــــرە قـــــــــوربـانـە
ژ پـشـــــتــــــا مـــــــە کـــــوردان چوو
ئـەڤ زانـــایـــێ زمـــــــــــــــــانـە

* ڤـازگـال بازیدی، وەلاتپـارێزێ دلسـۆز قـەدری جـان، و/ مـصـدق توڤی، ر: پەیمان، ژ: ٤٧، دهوک، ١٩٩٦ .

# سەرچاوەکان:

## کتێبە کوردییەکان

١- جگەرخوین، دیوانا یەکەم: پرسک وپێتی، چاپخانا باهۆز، شام، ١٩٤٥ . (لاتینی)

٢- جگەرخوین، ژینە نیگاریامن، وەشانێن ئاپەچ- ستۆکهۆڵم، ١٩٩٥ . (لاتینی)

٣- حوسێن حەبەش، راپەرینا چاندا کوردی دگۆڤارا هاوارێ دە، بەلاڤگەها هوگربونن، چ١، ١٩٩٦ .(لاتینی)

٤- هێمن مرکریانی، تاریک و روون، چ، بنکەی پێشەوا.

٥- دلاوەرێ زەنگی، نڤیسکارێ کورد قەدری جان، (دەستنووس).

٦- دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، چ خوێندنی باڵا، هەولێر، ١٩٩٠ .

٧- فەرات جەوەری، کولتور هونەرو ئەدەبیات، نوودەم، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٦ . (لاتینی)

٨- پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ، تاریخا ئەدەبیاتا کوردی، -١- ستۆکهۆڵم، سوێد، ١٩٨٣ . (لاتینی)

٩- مومتاز حەیدەری و نەژاد عەزیز سورمێ، کۆنگرەی ٩٠ ساڵەی لەدایکبوونی بارزانی نەمر، سەلاحەددین،١٩٩٣ .

## کتێبە عەرەبییەکان

١-تومابوا، مع الاكراد، ت: آواز زنگنه، مطبعة دار الجاحظ، بغداد، ١٩٧٥ .

٢- د. كمال معروف، الحركة التجديدية في الشعر الكردي الحديث، سويد، ١٩٩٨ .

٣- روشن بدرخان، صفحات من الادب الكردي، بيروت، ١٩٥٤ .

٤- مسعود البارزاني. البارزاني والحركة التحررية الكردية، الجزء الثالث، كوردستان، ١٩٨٧ .

## رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان

١- ادريس چەلكی، دیدارەک ل گەل رەوشەن بەدرخان، ر: بوتان، ژ: ٤، دهوک، ١٩٩١ .

٢- اسماعیل ابراهیم محمد صالح، قەدری جان و هوزانا کوردی یا هەڤچەخ، گ: کاروان، ژ: ٢٧، ١٩٨٤ .

٣- اسماعیل بادی، قەدری جان و هەڤبەندی و هوزان، گ: گازی، ژ: ٣٢، دهوک، ١٩٩٧ .

٤- ئەمین عالی بەدرخان، دەلالیا زاروان، گ: هاوار، ژ: ٥، شام، سالی ١٩٣٢ .

٥- جەلادەت عالی بەدرخان، ئارمانج، ئاوایێ خەبات و نڤیساندنا هاوارێ، گ: هاوار، ژ: ١، شام، ١٩٣٢ .

٦- جەلادەت عالی بەدرخان، شین، گ: هاوار، ژ: ١١، شام، ١٩٣٢ .

٧- حەسەن هشیار، قەدری جەمیل پاشا، گ: وان، ژ: ٦، ستۆکهۆلم، ١٩٩٣ .

٨- دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ، بۆ مەرگی قەدری جان، ر: ژین، ژ: ٨٤، ١٩٧٢ .
٩- دلاوەر زەنگی، هەلبەستڤان و نڤیسەرێ داهێنەر قەدری جان، و، ر: مەحەمەد عەبدوڵڵا، گ: رامان، ژ: ٥٤، ٢٠٠١ .
١٠- رەڤەند توڤی، قەدری جان، گ: مەتین، ژ: ١٤، دهوک، ١٩٩٢ .
١١- سادق بها ءالدین، جەلادەت بەدرخان، گ: کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (٧)، ١٩٨٠ .
١٢- سەبری بۆتانی، جگەرخوین ل عێراقێ، گ: نووسەری کورد، ژ: ٦، ١٩٨٨ .
١٣- شعبان مزیری، قەدری جان ئوکارێ داهێنانا هوزانێ، گ: روشنبیری نوێ، ژ: ١٤٣، ١٩٩٩ .
١٤- عەبدولرەزاق بیمار، دانیشتنێک لەگەڵ گۆران، گ: بەیان، ژ: ٢، ١٩٧٠ .
١٥- ڤازگال بازیدی، وەلاتپارێزێ دلسۆز قەدری جان، و/ مصدق توڤی، ر: پەیمان، ژ: ٤٧، دهوک، ١٩٩٦ .
١٦- لاوێ فندی، بەردێلک، گ: هاوار، ژ: ٢٢، شام، ١٩٣٣ .
١٧- قەدری جان، هاوار هەبە. گازی ل دوویە، گ: هاوار، ژ: ١، شام، ١٩٣٢ .
١٨- قەدری جان، بەردێلک، گ: هاوار، ژ:٦، شام، ١٩٣٢ .
١٩- قەدری جان، هەسنکەر، گ: هاوار، ژ: ٧، شام، ١٩٣٢ .
٢٠- قەدری جان، دشورەزارەکێ دە، گ: هاوار، ژ: ١٠، شام، ١٩٣٢ .
٢١- قەدری جان، تابووتا بخوین، گ: هاوار، ژ: ١١، شام، ١٩٣٢ .
٢٢- قەدری جان، جەگەرخوین، گ: هاوار، ژ: ١٢، شام، ١٩٣٢ .

٢٣- قەدری جان، خەونا هشیاریێ، گ: هاوار، ژ: ١٣، شام، ١٩٣٣ .
٢٤- قەدری جان، دادێ، گ: هاوار، ژ: ١٤، شام، ١٩٣٣ .
٢٥- قەدری جان، دەست ژێ بوو، هاوار، ژ: ١٦، شام، ١٩٣٣ .
٢٦- قەدری جان، جوهابا لاوانی ل دیبیا هاوارێ، گ: هاوار، ژ: ٢٠، شام، ١٩٣٣ .
٢٧- قەدری جان، هەی... دنیا فانی، گ: هاوار، ژ: ٢٢، شام، ١٩٣٣ .
٢٨- قەدری جان، دێرک، گ: هاوار، ژ: ٢٤، شام، ١٩٣٤ .
٢٩- قەدری جان، رەشبەلەک، ر: رۆژانوو، ژ: ١، بیروت، ١٩٤٣ .
٣٠- قەدری جان، شین، ر: رۆژانوو، ژ: ١٨، بیروت، ١٩٤٣ .
٣١- قەدری جان، رەیا تازە، گ: روناهی، ژ: ٢٦، شام، ١٩٤٢ .
٣٢- قەدری جان، بەگێ ئاخر زەمان، گ: روناهی، ژ: ٥-٦، بەغداد، ١٩٦١ .
٣٣- قەدری جان، کاروانێ مە، گ: روناهی، ژ: ١، بەغداد، ١٩٦٠ .
٣٤- قەدری جان، شێرێ وەلات... بارزانی هات، گ: هیوا، ژ: ٤، بەغدا ١٩٥٨ .
٣٥- قەدری جان، وەختی نیە، گ: گەلاوێژ، ژ: ٩-١٠، بەغدا ١٩٤٧ .
٣٦- قەدری جان، شینا پێشەوایێ مەزن قازی محەمەد، و/ ئەندازیار عەزیز بۆتانی، ر: العراق، ژ: ٢٨٢٠، بەغدا ١٩٥٨ .
٣٧- قەدری جان، هەیڤا سۆر، ر: ئازادی، ژ: ٣٠، کەرکووک ١٩٥٩ .
٣٨- قەدری جان، چاردەی گەلاوێژ، گ: هیوا، ژ: ٣، بەغدا ١٩٥٨ .
٣٩- قەدری جان، نامە بۆ ئێستگەهێ رادیۆ تاران، ر: ئازادی، ژ:٤٦، کەرکووک، ١٩٥٩ .
٤٠- هاوار، جوهابا دایکێ، گ: هاوار، ژ: ١٨، شام، ١٩٣٣ .

٤١- مصطفى نەریمان، بۆ سودی گشتی، گ: رۆشنبیری نوێ، ژ:١٢٧، بەغدا ١٩٩١

## رۆژنامەو گۆڤارە عەرەبییەکان

١- ادريس محمد علي، الذكرى التاسعة لرحيل قدري جان، جريدة: العراق، العدد:١٦٧٤، ١٩٨١ .

٢- اديب نادر، بين البارزاني و قدريجان، مجلة (مەتين)، العدد: ٣٠، دهوك ١٩٩٤ .

٣- د. عزالدين مصطفى رسول، بكائية الى قدري جان، جريدة التأخي، العدد: ١١٢٦، ١٩٧٢ .



سەرۆک بارزانی نەمر -ئەفسەر- قەدری جان(عێراق) ١٩٥٨
ئەم وێنەیە لە پەرتووکـەکـەی دلاوەرێ زەنگی (نڤـیـسـکارێ
کورد قەدری جان) وەرگیراوە.



قەدری جان لەگەڵ دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملو لە شاری دیمەشق
ئەم وێنەیە لە پەرتووکەکەی دلاوەرێ زەنگی (نڤیسکارێ کورد قەدری جان) وەرگیراوە.



راوەستاوەکان لەراستەوە:
عومەر محیەدین شەریف، عیسمەت شەریف وانلی، دکتۆر نورەدین زازا، جەمشید جەلادەت بەدرخان، قەدری جان، عەمید روکن محەمەد عەلی زلفۆ، عەبدولرەحمان زەبیحی، رەمو عامودی، عەلی فەتاح دزەیی، عزەدین مستەفا رەسول.
دانیشتوەکان لە راستەوە:
قەدری جەمیل پاشا دیاربکری (زنار سلۆپی)، عومەر ئەمین دزەیی، عوسمان سەبری (ئاپۆ). بڕوانە نامەی ماستەری مامۆستا بەکر شاکر عەبدوڵلا، بەناوی (عەلی فەتاح دزەیی-شاعیرو نووسەر) لاپەڕە ١٩٠.



قەدری جان لەگەڵ عەلی فەتاح دزەیی، دکتۆر نورەدین زازا، دکتۆر ئەحمەد
عوسمان ئەبوبەکر. بڕوانە نامەی ماستەری مامۆستا بەکر شاکر عەبدوڵڵا،
بەناوی (عەلی فەتاح دزەیی-شاعیرو نووسەر) لاپەڕە




گۆڕی قەدری جان لە شام
ئەو شیعرەی کە لەسەر کێلگەی نووسراوە هی (عیزەت ئاغایێ دێرکی)یە.
ئەم وێنەیە لە کاک ئاکۆ محەمەد - سەرنووسەری رۆژنامەی( میدیا )م وەرگرتووە.




گۆڕی (میر جەلادەت بەدرخان)
ئەو شیعرە کە لەسەر کێلکەی نووسراوە هی (قەدری جان)ە.